حکومەتا هەرێما کوردستانێ – عیراق
وەزارەتا پەروەردەیێ
رێڤەبەریا گشتی یا پرۆگرام و چاپەمەنییا

# پەروەردەیا ئیسلامی

## بۆ پۆلا حەفتێ بنەڕەت

**بەرهەڤکرنا**

عبدالله عبدالرحمن بابان — واحد حمه صالح — عبد الجبار محمد شريف
ئازاد عمر سيد أحمد — خواجة طه شاهين — صادق عثمان عارف

**پێداچوونا زانستی**

عبد الجبار محمد شريف

**وەرگێڕان ژ عەرەبی بۆ کرمانجییا ژۆری**

ئیسماعیل تاها شاهین — تەحسین ئیبراهیم دۆسکی

**پێداچوونا زمانی**

خواجة طه شاهين

چاپا دووێ — ٢٧١٦ کوردی — ٢٠١٦ زایینی — ١٤٣٧ مشەختی

# پێشگۆتن

ئەڤ کتێبە – پەروەردەیا ئیسلامی بۆ رێزا حەفتێ یا بنەرەت – پێگاڤا حەفتێیە ژ نەخشەیێ گوهۆڕین و پێشئێخستنا پرۆگرامێ بابەتێ پەروەردەیا ئیسلامی، ئەوێ وەزارەتا پەروەردەیێ بڕیار پێ دایی، و ژ بۆ ب سەرێکڤەئینانا ڤی کاری و هنگاڤتنا ڤێ ئارمانجێ ئەم وەك لژنە هلبژارتین.

د بەرهەڤکرنا ڤێ کتێبێدا تشتێ گرنگێ ب خەم هاتییە وەرگرتن، گوهۆڕینا ئاوایێ (شێوازێ) بەرچاڤکرنا وانەیانە، سەرباری بابەتێن وانەیان ب خوەژی، کو جودانە ژ یێن پرۆگرامێ پێشتر. د سەر وان کارێن ب پەرستنێڤە گرێدایی، مە بزاڤ کرییە د ڤێ کتێبێدا، ئەم پیتەیەکی ڕژد بدەینە هندەك ئالییێن دی یێن گرنگ ژی، وەکی دیارکرنا ژینەنیگارا هندەك هەڤال و هۆگرێن پێغەمبەری و چەند کەسەکێن پشتی وان هاتین، د گەل دانەناسینا هندەك ژ وان زانایان، ئەوێن خزمەتا ڕێبازا بانگ و گازییا ئیسلامی کرین. ئارمانجا مە ژ ڤێ هەمییێ ئەوە، ئەم کوڕێن خوە یێن قوتابی، د دینیدا شارەزا بکەین، و وان ل دووڤ پەروەردەیەکا دورست پەروەردە بکەین، دا بشێن ڕۆلێ خوە ب دورستی د ئاڤاکرنا پاشەڕۆژا وەلاتێ مەدا ببینن.

هەروەکی مە د پێشگۆتنا کتێبێن قۆناخێن پێشتردا ژ ڤی پرۆگرامی گۆتی، جارەکا دی و دوبارە ئەم دێ بێژین، کارێ لژنەیا مە ل ئێرە ب دووماهی دئێت، و ب هندێ کارێ هەڤکارێن مە، مامۆستایێن پەروەردەکەر دەست پێ دکەت. ئەرکێ وان ژی بێ گۆمان ئەوە، ڤێ نامەیێ ئێکسەر و ڕوو ب ڕوو بگەهیننە کوڕێن مەیێن قوتابی. دوور نائێتە دیتن، د بەر کارێ خوەڕا، ب سەر هندەك کێماسییان ژی هلببن، مە پێ خوەشە، مە ژێ ب ئاگەه بێخن، دا ئەم بشێین، د چاپێن پاشتردا، ڕێکا خوە ل سەر بگوهێزین و خوە ژێ بدەینە پاش.

ل دووماهییێ ژی، داخوازا مە ئەوە، خودایێ مەزن ڕێکا سەرکەڤتنا ڕێبازا پەروەردەیی د کوردستانێدا، ل بەر مە سانەهی و خوەش بکەت، و مە هەمییان تێدا بکەتە دەستێن ب سەرئێخستن و ئاڤاکرنێ.

**لژنەیا بەرهەڤکرنێ**

## بانگهلدێری و بنسترا وێ د ئیسلامێدا

خەلك هەمی ژ ڕێڤە، ل سەر ئێکتاپەرستی و باوەر و پەرستنا خودێ، ئێك مللەت بوون، پاشێ ژێك جودابوون و ژێك چوونە پاش. خودایێ مەزن، پێغەمبەر هنارتن، بۆ پەرستنا خودێ و گرتنا ڕێكا وی، گازی خەلکی کرن، گازیکرنا خەلکی ژ بۆ پەرستن و گرتنا ڕێکا خودێ و قەنجیکرن، ئێکە ژ کار و کریارێن پێغەمبەران، لەو فەرە ل سەر مە، ئەم ل سەر هندەك کار و کریارێن پێغەمبەران ڕاوەستین کو ئەڤە چەندەکن ژێ:

١- **گازیکرنا خەلکی ژ بۆ پەرستنا خودێ:** ئانکو گوهداریکرن و گرتنا ڕێکا خودێ و جهێئینانا هەر فەرمانەکا وەك باوەر و گۆتن و کریار دایی.

٢- **گەهاندنا ئاشکەرا:** ڕۆنکرن و ئاشکەراکرنا وێ (وەحی)ییێیە، ئەوا خودێ بۆ بەندەیێن خوە هنارتی، چونکی پێغەمبەر چێتر مەرەم و ڕامانێن وێ دزانن.

٣- **هاندان و ترساندن:** مزگینیدان و ترساندنا مرۆڤان ب وی ئاوایێ پێغەمبەر بۆ هاتینە هنارتن، کلیلا ڤەکرنا دەروونێ مرۆڤاتیێیە، ئەو دەروونێ دوباری ل سەر هندێ هووگرتی، کو تنێ خێر بۆ خوە بڤێت و خرابیێ ژ خوە ب تنێ بدتە پاش، ڤێجا ئەرکێ پێغەمبەران ئەوە، خەلکی ڕووباری ڕاستییا کارێن وان بکەن، دا بزانن، یێ خێرێ بکەت، خێرێ دێ بینت، و یێ خرابیێ ژی بکەت، جزایێ خرابییا خوە دێ بینت.

٤- **چێکرن و پاقژکرنا دەروونان:** خودایێ مەزن ب (وەحی)یا خوە، خەلکی ژ تاریستانێ ڕزگار دکەت و بەرێ وان ددەتە ڕۆناهییێ، ئەڤە ژی ب هندێ ب جه دئێت، کو ڕێ و نیشانێن خودایێ خوە فێر ببن و دەروونێ وان ب ناسینا وی پاقژ ببت.

لەو پێغەمبەرێ مە ژی (سلاڤ لێ بن) فەرمان داییە، تشت ژێ بێتە ڤەگوهازتن، بلا خوە ئایەتەك ژی بت، و دوعا بۆ هەر کەسەکێ ژی کرییە، تنێ فەرمۆدەیەکێ ژی، ژێ ڤەگوهێزت، و گۆتییە: ڤەگوهازتنا سونەتا من بۆ موسلمانان، خوە ژ هنگاڤتنا جەرگێ دژمنی ب تیران ژی چێترە. خودایێ مەزن دبێژت: **((وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلاً مِمَّنْ دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ)) (فصلت ١٢٥)**، ئانکو کەس ژ وی موسلمانی ئاخڤتن خوەشتر و باشتر نینە، ئەوێ بانگ و گازییا خوە بۆ گرتنا ڕێکا خودێ هلددێرت، و بەرێ خەلکی ددتە گوهدارییا خودێ و پێغەمبەرێ وی (سلاڤ لێ بن)، و کار ب یاسا و

شەریعەتێ وان بکەت، و د هەمی کار و باراندا هەوارا خوە بگەهینتێ و پێ بکەت، ئەها ئەڤەیە کەسێ ژ هەمییان چێتر و ئاخڤتن خوەشتر و باشتر.



## بانگهلدێری ژ بۆ گرتنا ڕێکا خودێ دڤێت چاوا بت؟

بانگهلدێران بۆ گرتنا ڕێکا خودێ ب ئاوایەکی گشتی و د ناڤ خودان کتێباندا ب ئاوایەکی تایبەت، دڤێت ڕێکا نەرمی و ژیرییێ بگرت، ڕێکا ئاراستەکرنەکا مفادار و بەرهەمدار، کو عەقلی و دلی پێکڤە باخێڤت. ئەگەر گەنگەشە و دان و ستاندنەك ژی هەبت بۆ تێگەهاندنێ، دڤێت ڕێکا ڤایلکرنێ بگرت، و خوە هلنەپەسێرتە زڕەتۆپزی و تەعداییێ. خودایێ مەزن دبێژت: ((**أدعُ إلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ**)) **(النحل ١٢٥)**

د ڤێ ئایەتێدە، خودێ داخوازێ ژ پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) دکەت کو ب ژیری بانگ و گازییا خوە بۆ گرتنا ڕێکا خودێ هلدێرت، کاودانێن گازیکرییان و تێگەهشتنا وان ل بەرچاڤان بت، و وێ ئاخڤتنێ بێژتە وان، ئەوا دلێ وان نەرم دکەت، نە وێ بێژت، ئەوا وان ژ گوهدارییا خوە برەڤینت، ب نەرمی ئاخڤتنێ رابەری وان بکەت، دا بزانن مەرەما وی تنێ ڕاستییە، نەکو سەردەبرن و مفاوەرگرتنە ژ گازییێ، کا پێغەمبەری چ خێر ژ ڤێ گازییێ بۆ خوە دڤێت، ئەو بۆ وان ژی دڤێت، ب باشترین ڕێك گەنگەشە و دان و ستاندن د گەل وان بێتە کرن، ڕێز ل یێ بەرانبەر بێتە گرتن و نەئێتە پاشدەبرن. پێغەمبەر وان بەلگەیان بینت، ئەوێن هەردو ئالی ژێ ب باوەر، ب وان بەلگەیێن عەقلی گەنگەشە د گەل خودان کتێبان بێتە کرن، ئەوێن هەردو ئالی پەسەند دکەن و دهەڤینن، هەروەسا ئەو ڕێك بێنە گرتن، ئەوێن بەرێ دلان ددەنە هەڤییێ و نەرم دبن بۆ وەرگرتنا وێ، پشتی ڤێ هەمییێ خوە ل هندێ نەگرت کا دێ چ ب سەر بانگ و گازییا وی کەڤت، ڕاستەڕێبوون یان سەردەچوون و گومڕایی، تشتێ ل سەر وی تنێ گازیکرن و بانگهلدێرانا دورست و گەهاندنا جوانە، هندی ڕاستەڕێیی و گومڕاییە، ئەڤە ب دەستێ خودێنە، و خودێ چێتر دزانت، کا کی بەرهەڤ و ئامادەیە بۆ وەرگرتنا ڕاستییێ و هلبژارتنا ڕێکا گومڕایی و سەردەچوونێ. ((**وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ**)).

### د چ دا بانگهلدێری دیار دبت؟

بانگ و گازی د وان هەردو پشکێن شەهادەتێدا دیار دبت، ئەوێن بۆ وەك دو ستوونان.

**ستوونێ ئێکێ**: باوەری ب هەبوون و ئێکتاییا خودێ. ئێکتاپەرستی د قورئانێدا وەك باوەر، هێژاترین و بلندترین زانستە کو مرۆڤ پێ سەرفراز و بلند دبت، و ئەڤ ستوونە ئەو مەخسەدە ئەوا پشکا ئێکێ ژ شەهادەتێ (**أشهدُ أنْ لا إلهَ الا الله**) دگەهینت.

**ستوونێ دوییێ**: باوەری ب پێغەمبەرێ خودێ موحەممەد (سلاڤ لێ بن) وێ ڕامانێ ددەت:

أ- پێدڤییه باوەری پێ بێته ئینان، کو پێغەمبەرێ خودێیه و دووماهی پێغەمبەره.

ب- پێدڤییه باوەری ب وی تشتی بێته ئینان ئەوێ پێ هاتی.

ج- پێدڤییه گوهدارییا وی بێته کرن د هەر تشتەکێ گۆتی و کری و بڕیار پێ دایی، چ فەرمانا کرنێ بت، چ ژی یا نەکرنێ بت، و ئەڤ ستوونه، ئەو مەرەم و مەخسەده، ئەوا پشکا دویێ ژ شەهادەتێ (**أشهدُ أنَّ محمداً رسولُ اللهِ**) دگەهینت.

## زۆرلێکرن و زڕەتۆپزی د دینیدا:

خودایێ مەزن دبێژت:((**لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ ...**)) (**البقرة ٢٥٦**). ژ بەلگە و نیشانێن نەرمی و سنگفرەهییا ڤی دینی، د گەل کەسێن د باوەر و پەرستنا خوەدا، ژێ جودا ئەوە، زۆرییێ ل وان ناکەت ببنه موسلمان، بەلکو ڕێکا ئازادییێ ژی ل وان ناگرت، و دەلیڤەیێ ژی ل بەر وان ڤەکری دهێلت، دا هزرێن خوە باش بکەن و بڕیارا خوە دووری ترس و زۆرلێکرنێ ل دووڤ دلێ خوە بدەن.

بنەمایێ گرنگێ خودایێ مەزن د قورئانێدا بڕیار پێ دایی، ڕۆن و ئاشکەرایه، و هندێ ناخوازت زۆری ل کەسێ بێته کرن، دا ببته موسلمان، هەر کەس ئازاده د باوەریئینانا خوەدا، پشتی ڕاستەڕێیی و گومڕایی و ڕاستی و نەڕاستی ژێك هاتینه ڤاقارتن و دیارکرن. کەسێ ل دووڤ ئیسلامێ بچت و پشتا خوە بدەته گاوری و گومڕاییێ، ئەڤه وی دینێ ڕاست و دورست بۆ خوە هلبژارت و باوەرا موکوم ب دەست خوەڤه ئینا و ب سەر ڕاستییا ئاشکەرا هلبوو.

**دان و ستاندن:**

- هەردو ستوونێن بنیاتی یێن هەردو پشکێن شەهادەتێ چنە؟ ڕۆن بکە.
- (زۆری ل کەسێ نائێتە کرن، ببتە موسلمان، هەر کەس سەربەست و ئازادە د باوەریئینانا خوەدا). گەنگەشەیێ ل سەر ڤێ دەستەواژەیێ بکە، و د ڕۆنکرنا خوەدا، ئایەتەکا قورئانێ بینە، هەمان ڕامانێ بدەت.

**ژ ڕامانا ڤان ئایەتان کارێ پێغەمبەران دیار بکە:**

١- خودێ دبێژت: ((اللهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا يُخْرِجُهُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ ...)). (البقرة ٢٥٧).

٢- خودێ دبێژت: ((كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً فَبَعَثَ اللَّهُ النَّبِيِّينَ مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ ...)). (البقرة ٢١٣).

٣- خودێ دبێژت: ((يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ وَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ)). (المائدة ٦٧)).



## وانەیا سێیێ

# پەرستنا خودێ



## ڕامانا پەرستنێ:

**پەرستن**: گوهداری و خوەشکاندنه بۆ فەرمانێن خودایێ مەزن، ب ڕێکا جهێنانا وان، وەکی کرنا نڤێژێ، گرتنا ڕۆژییێ، دانا زەکاتێ، چوونا حەجێ، دوعاکرنێ، خواندنا قورئانێ، گوهدارییا دەیبابان، خێردانێ، ڕاستگۆتنێ، سپارتنا ئەمانەتێ و ئاخفتنا خوەش.

بێ گۆمان، چارچۆڤ و بازنێ پەرستنێ د ئیسلامێدا ل جهێنانا چەند فەرمانەکان ب تنێ ڕاناوەستت، بەلکو هێژ فرەهترە، هەمی کار و کریارێن مرۆڤێ موسلمان دگرت، هەتا ڤەدپەڕتە ڕەفتارێن وی یێن ئاسایی ژی، وەکی خوارن و ڤەخوارن و نفستنێ. مرۆڤێ موسلمان دەمێ خوارنێ دخوت، کارێ وی ئەڤە پەرستنە، ب خێر بۆ دئێتە هەژمارتن - ئەگەر خوارن و ڤەخوارنا وی دورست و حەلال بت - هەروەسا هەمی کارێن وی یێن دی ژی. پەیڤا دین د زمانێ عەرەبیدە ڕامانا (خوەشکاندنێ) ددت، ئانکو: دیارکرنا خوەشکاندن و ستوچەماندنێ بەرانبەری پەرستی. موسلمان خوە بۆ خودێ دشکێنن، هەروەسا

نەموسلمان ژی خوە بۆ پەرستی و بیر و باوەرێن خوە دشکێنن و خوە بۆ وان دچەمینن و دەستێن خوە ڕابەری وان دکەن و دوعایێ ژێ دکەن. تشتێ گرنگ ل ئێرە ئەوە، ئەو سڤکاتی و یارییان ب پەرستییێن خوە ناکن و ڕژدن د پەرستنا خوەدا. ل ئێرە جهێ هندێیە پسیار بێتە کرن، ئەرێ ما خودێ نە هێژایی هندێیە، مرۆڤێ موسلمان خوە بۆ بشکێنت و سەرێ گوهدارییێ بۆ بچەمینت؟

## پەرستنا خودێ تشتەکی سروشتییە :

سروشتێ مرۆڤی، ئەوێ پاك و ڕەسەن، مرۆڤی دگەهینتە هندێ، کو خودێ بنیاست و بپەرێست، ئەڤە ئەگەر ل سەر ڕەوشا خوە یا بنیاتییا ساخلەم مابت. خودایێ مەزن دبێژت: ((**فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا** ...)) **(الروم ٣٠)**.

ئەڤ ئایەتا پیرۆز بەلگەیە ل سەر هندێ، کو (بەر ب خودێ چوون)، تشتەکی سروشتییە ل دەڤ هەر مرۆڤەکێ، و بەلگە و نیشانە ل سەر هندێ، کو پەرستنا خودێ، د گەل سروشتێ مرۆڤی گونجاییە، لێ بەلێ گاوری و ژ ڕێ فارێبوون، دەرکەڤتنە ژ سروشتێ ژێگۆتی. دەمێ هندەك مرۆڤ قەستا پەرستنا غەیری خودێ دکەن، هنگێ ئەڤە ل دووڤ کارلێکرنا هندەك ئەگەرێن دەرەکی دئێتە ئەنجامدان، وەکی کارلێکرنا دەیبابان و یا ژیوارێ جڤاکی. ئەها ئەڤەیە ئەوا پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) تل بۆ درێژکری، دەمێ گۆتی: ((کلُ مولود یُولدُ علی الفطرة فأبواه یُهوِّدانه أو ینصرانه او یمجسانه)). ئانکو هەر کەسەك ل سەر سروشتێ خودێ کو ئێکتاپەرێسییە، ب سەر دنیایێ دکەڤت، پاشتر دەیباب وی دکەنە جوهی یان فەلە یان ئاگرپەرێس.

## پەرستنا خودێ پێدڤییەکە :

پالدەرەکی سروشتی هەیە، مرۆڤی هەردەم پال ددت کو قەستا خودێ بکەت، دا خودێ هەوجەیی و پێڤییێن وی بۆ سانەهی بکەت، دەمێ خوە بێ چارە و بێ دەستهلات دبینت. ئەڤە شوونا هەڤبەندییەکا ڕووحییە، د ناڤبەرا مرۆڤی و خودایێ ویدا، کو وە ل دەروونێ مرۆڤی دکەت، هەست بکەت خودانهێزەك هەیە، وی دپارێزت و پشتەڤانییا وی دکەت و رزقی ددەتێ و ساخ دکەت، ئەو دەمێ ژ مال دەردکەڤت و دبێژت: (بسم الله وعلی الله توکلت - ب ناڤێ خودێ، من پشتا خوە ب خودێ گرێدا)، هزر دکەت چو زیان و بەلا بەرهنگاری وی نابن. هەر کەسەکێ ژ ڤێ پەیوەندییا ڕووحی بێ بار بت، کەسێ بۆ خوە وەك هاریکار نابینت، وی بپارێزت، چونکی وی چو هەڤبەندییێن ڕووحی د ناڤبەرا خوە و خودێدا چێنەکرینە.

## جهێنانا فەرمانا خودێ پەرستنا وییە :

هەر ژ ڕێڤە دەمێ مرۆڤ ژ بەرێ خودێڤە هاتییە چێکرن، فەرمانا پەرستنا خودێ بۆ هاتییە دان. چو مللەت نەهاتینە سەر ڕوویێ ڤی ئەردی، پێغەمبەرەك بۆ وان نەهاتبتە هنارتن، و (وی پێغەمبەری) داخوازا پەرستنا خودێ ژ وان نەکربت. خودایێ مەزن دبێژت: ((**وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولاً أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ...**)) **(النحل ٣٦)**.

پەرستنا خودێ، ماف و ئەرکە ل سەر ملێ بەندەیێن خودێ: نە تشتەکی نەبوویییە، خودێ ماف ل سەر بەندەیێن خوە هەبت، تشتێ نەبوویی ئەوە، ئەڤ مافە بۆ خودانێ خوە کو خودێیە، نەئێتە هەڤاندن. پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) مە ئاگەهداری ڤی ماڤی دکەت، دەمێ دبێژت: **((حقُّ الله على عبادِهِ أن يعبدوه ولا يُشركوا به شيئاً))**. ئانکو: مافێ خودێ ل سەر بەندەیێن وی ئەوە، وی بپەرێسن و چو هەڤال و هەڤپشکان بۆ چێ نەکەن.

ئەگەر بێتە گۆتن: بۆچ پەرستنا خودێ ل سەر مرۆڤی هاتییە فەرکرن؟

د بەرسڤا ڤێ پسیارێدا ئەم دێ بێژین: چونکی پەرستن مافێ خودێیە، ل سەر بەندەیێن وی، خودێیە چێکەر و رزقدەهـ و پشتەڤانێ وان د تەنگافییاندا، ئەوە ساخکەرێ نەساخ و نەخوەشێن وان، ئەوە دوعاوەرگرێ وان.

## پەرستن کار و کریارە:

پشتی باوەر ڕێکا خوە ب دلی دئێخت و خوەجه دبت، مرۆڤ دبتە باوەردار، و دڤێت کارەك هەبت، شادەیییێ بۆ ڤێ باوەرێ بدەت و بۆ ببتە پشت و بەلگە - ئانکو: بچتە د ڤۆناخا کریارێدا - و هنگێ بەر و بەرهەمێ باوەرێ دیار دبت، و د ڤی واریدا پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((ليس الايمان بالتمني ولا بالتحلّي ولكن ماوقر في القلبِ وصدَّقه العملُ)) ئانکو: باوەر نە ب خوەزییانە، نەژی ب خەملاندنێیە، بەلکو باوەر ئەو تشتە، ئەوێ د دلیدا خوەجه دبت، و کار و کریار بۆ دبنە پشت و بەلگە و نیشان.

ئانکو دڤێت باوەرێ کار و کریارێن باش د گەل بن، ژ بەر هندێ مرۆڤێ باوەردار دێ بینی نڤێژێ دکەت، ڕۆژییێ دگرت و ب هندێ ژ غەیری خوە دئێتە ڤاڤارتن و دچتە د ناڤ ڕێزا (باوەردارێن خودێپەرێس)دا، ئانکو باوەردارێن ڕاست و ڕاستگۆ.

## وانەیا چاری

## جوونێن پەرستنان



### پەرستن چار جوونن:

### ١ - پەرستنا دلی:

ئەوە ڤیان و نەڤیان و ترس و هیڤییا باوەرداری ژ بۆ خودێ بت.

### ٢- پەرستنا گیانی:

ئەوە مرۆڤێ باوەردار نڤێژێ بکەت و ڕۆژییێ بگرت و بچتە حەجێ ئەگەر بشێت.

### ٣ - پەرستنا گۆتنکی:

ئەوە مرۆڤێ باوەردار خودێ بینتە بیرا خوە و دەستێن خوە ڕابەری وی بکەت و قورئانا پیرۆز بخوونت.

### ٤ - پەرستنا مالی:

ئەوە مرۆڤێ باوەردار زەکاتا مالێ خوە بدەت و خێرهاتنێ د گەل ژار و دەستتەنگان بکەت و دەستێ وان بگرت.

د ڕێکێدا، هەڤبەندی ب ڕێکا تەلەفۆنێ، یان نڤیسینێ، ناڤبەین ناڤبەین بێتە کرن، ئەڤە هەمی هەڤبەندییا مرۆڤانییێ ب هێز دئێخت و ڤیانێ د ناڤبەرا کەسێن نێزیکی ئێکدا پەیدا دکەت و مرۆڤانییێ دەم بۆ دەم دئینتە بیرا وان و دلێن وان پێك خوەش دبن.



## دان و ستاندن

س ١ – بەرسڤا دورستا د ناڤبەرا دو کڤاناندا هلبژێرە:

١- کەسێ مرۆڤانییێ دورست دگرت ئەوە ئەوێ (پشتا خوە ددەتە وی، ئەوێ پشتا خوە ددەتێ)، (قەنجییێ شوونا قەنجیی دکەت)، (ژ بۆ کنارێ خودێ مرۆڤانییێ دگرت).

٢- ژ ڕەوشتێن گرتنا مرۆڤانییێ ئەوە چاڤێ مرۆڤی ل: (پارەیی)، (دەستخوەشییێ)، (خەلات و پاداشتێ خودێ) بت.

٣- گرتن و هەڤبەندییا مرۆڤانییێ: (ڤیانێ)، (کەربێ)، (نەڤیانێ) د ناڤبەرا کەسێن مرۆڤێن ئێکدا پەیدا دکەت.

س٢- ڤان نێزیك و لێزمان ل دووڤ نێزیکاتییا وان بۆ گرتنا مرۆڤانییێ ڕێز بکە:

١- پسمام ٢- باب ٣- برا ٤- دایك.

س٣- هەردو جوونێن مرۆڤاتییێ کیژکن؟ هەر ئێکێ جودا بێژە و بەحس ژێ بکە.

س٤- باشی و بەرهەمێ گرتنا مرۆڤانییێ یا هەر فەرمۆدەیەك ژ فەرمۆدەیێن خوارێ دگەهینت چیە؟ جودا بەحس بکە و بێژە.

١- ژ (جبیر بن مطعم) هاتییە ڤەگوهازتن کو پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) گۆتییە: **((لایدخل الجنة قاطع رحم** – کەسێ مرۆڤانییێ نەگرت، ناچتە بەهەشتێ)). (ئێك ئاخڤتنن ل سەر، بوخاری و موسلم ڤەگوهازتییە).

٢- ژ (أنس بن مالك) هاتییە ڤەگوهازتن، کو پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) گۆتییە: **((من أحب ان يبسط له في رزقه وينسأ له في اثره فليصل رحمه** – کەسێ بڤێت ڕزقێ وی بەرفرەه ببت و ژییێ وی درێژ ببت، بلا مرۆڤێن خوە بەرنەدت)). (ئێك ئاخڤتنن ل سەر).

٣- ژ عائیشایێ (خودێ ژێ ڕازی بت) هاتییە ڤەگوهازتن، کو پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) گۆتییە: **((صلة الرحم وحسن الخلق وحسن الجوار يعمرن الديار ويزدن في الاعمار** – گرتنا مرۆڤانییێ و ڕەوشتپاکی و جیرانخوەشی، وەلاتان ئاڤا دکەن و ژییان درێژ دکەن)). (دورستە ئیمام ئەحمەد ڤەگوهازتییە).

٤- پێغەمبەرێ خودێ (سلاڤ لێ بن) دبێژت: (( قال الله تعالى: حقت محبتي للمتواصلين فيَّ– ڤیانا من بۆ وان حەقبوویە ئەوێن ژ بەر من سەرا ئێك ددەن)).( دورستە ئیمام ئەحمەد ڤەگوهازتییە)

## ڕەوشتێن بلندێن مرۆڤێ موسلمان



ڕەوشتێن بلند ژ سالۆخەتێن باوەردارانن، فەرمان ژ بەرێ خودێڤە پێ هاتییە دان، و پێغەمبەرێ ژی (سلاڤ لێ بن) ئەم ل سەر هندێ پشتڕاست کرینە کو: **((إنما بعثت لأتمم مكارم الاخلاق – ئەزێ هاتیمە هنارتن، دا ڕەوشتێن بلند تەکووز بکەم)).**

ڤێجا کەسێ باوەردار ب ڕەوشتێن خوە یێن بلند ناڤدارە، ئەو ڕەوشتێن کەسینییا وی سەربلند دکەن و هندی ل سەر باوەرا خوەبت، د گەل دمینن. پاڤژییا باوەرێ ڕەوشتێ مرۆڤێ موسلمان بژوون دکەت، و بلندییا باوەرێ، پێك و پەیسکا باوەرداری د جڤاکێدە، بلند دکەت، و ڕاستییا وێ، زمانێ باوەرداری ڕاست و دورست دکەت.

ڤێجا تو هەی قوتابییێ خوەشڤی و هەی قوتابییا قەدرگران - ئەگەر ژ وان بی ئەوێن حەز ژ ڕەوشتێن بلند دکەن وەکی: پاقژییێ، لێبوٚرینێ، بێنفرەهییێ، شەرمێ، هاریکاری و وەفادارییێ، ب لەز خوە باڤێژە ڤان ڕەوشتان و بەر پێ هەرە، و موکوم بگرە.

ڕەوشتێن ئاخفتن ل سەر گەلەکن، ل ئێرە ئەم دێ سێیان ب تنێ ژێ بێژن:

**١- دەهمەنپاکی**: خوە دوورئێخستنە ژ هەمی قەدەغەیان (حەرامان) ب گشتی، و پارزتنا دانگ و دەهمەنێیە ژ کریارێن پیس ب تایبەتی.

خودایێ مەزن فەرمانا موسلمانان کرییە، دەهمەنا خوە بپارێزن و خوە بێنفرەه بکەن ل سەر دلچوون و چاڤچوونا سەربەردایی، و حەزکرنێن نە د جهێ خوەدا، دەستەسەر بکەن، دا ژ دەهمەنپیسییێ

و هەر تشتەکی بەرێ مرۆڤی ددەتێ، دوور بکەڤن. ڤێجا پێدڤییە ئەم خوە ژ ڤێ نەخوەشییا ب ترس بپارێزین، چونکی، ئەو وەکی ئێشەکا ڤەگرە زوو بەلاڤ دبت، و هەر گاڤەکا ئەم نێزیك ببن، کار ل مە دکەت، و گاڤا ئەم ژێ دوور دکەڤین، ژ کارلێکرنا وێ دئێینە پارزتن و ژ بەلا و نەخوەشییا وێ ڕزگار دبین.

گەلەك ئایەت د قورئانا پیرۆزدا هەنە، داخوازێ ژ مە دکەن، ئەم خوە ژ ڤێ کریارا پووچ و نە د جهێ خوەدا بدەینە پاش، خودایێ مەزن دبێژت: **((وَلاَ تَقْرَبُوا الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلاً )- خوە نێزیکی دەهمەنپیسییێ نەکەن، ئەو پووچەکریار و نەچو ڕێکە).** (الاسراء ٣٢).

بەرئاقل نینە مرۆڤێ باوەردار خوە دەهمەنپیس بکەت، و ئەو ل سەر باوەرا دورست بت، چونکی دەهمەنپیسی و باوەر ل دەڤ ئێك کەسی و د ئێك دەمیدا ڤێك ناکەڤن - بەلگە ژی ئەو ئاخڤتنا پێغەمبەرییە (سلاڤ لێ بن) ئەوا دبێژت: **((لايزني الزاني حين يزني وهو مؤمن )– کەسێ دەهمەنپیس گاڤا دەهمەنپیسییێ دکەت، ئەو باوەردار نینە)).**

چو خرابی، بۆ خرابی و پیسییێ ناگەهنە دەهمەنپیسییێ. کەسینییا مرۆڤێ موسلمان ژ هندێ بلندترە، خوە بینتە ڕێزا نزماتییا کریارەکا وەکی دەهمەنپیسییێ، نەمازە پشتی دەروونێ وی ب باوەرێ، ژ دلچوونێن خەلەت هاتییە ئازادکرن. کەسینییا وی یا بلند وی ژێ ددەتە پاش و دوور دئێخت، بەلکو ب سڤکی ژی بەرێ خوە ددەتێ. ژ بەر ڤێ چەندێ دەهمەنپیسی نە هێژایی مرۆڤێ موسلمانە. دڤێت مرۆڤێ موسلمان ب هش و مەژییێ خوە هزرێن خوە بکەت، چونکی ئەو هەردەم بەرێ مرۆڤی ددەنە سالۆخەتێ دەهمەنپاکییێ.

## نیشانێن سالۆخەتێ دەهمەنپاکییێ:

أ- پارزتنا ڕوومەت و نامووسێ.

ب- ناڤ و دەنگێن باش.

ج- باوەری د ناڤ خەلکیدا.

د- ئاڤاکرنا کەسینییەکا ل بەر خوە ڕاوەستایی.

هـ- پارزتنا ساخلەمییا لەشی.

**٢- دەستپاکی:** خوە دوور ئێخستنە ژ بێوژدانیێ (خیانەتێ) و دزی و زەغەلییێ.

دەستپاکی ئێك ژ سالۆخەتێن مەزن و گرنگە ل دەڤ کەسێ دەستپاك. ئەوە مرۆڤێ دەستپاك د بەر هندێرا دکەت کو تشتێ پێ هاتییە سپارتن، ل دەڤ خوە هلبگرت و بپارێزت، چ ئاخڤتن بت، چ ژی مال و تشتەکی نهینی و ڤەشارتی بت.

## جوونێن دەستپاکییێ:

أ- دبت دەستپاکی ئاخڤتنەك بت، ئێك دێ بێژتە ئێکی دی، دڤێت بێتە پارزتن و نەئێتە دەرەهیکرن، چونکی نهینییە خودانی یا سپارتییێ، ڤێجا تشتێ سپارتی (ئەمانەت) ل دەڤ، و پارستنا وی ئەرکە ل سەر مە، پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) دبێژت: **((اذا حَدَّثَ الرجلُ الحديث ثم التفت فهي أمانة** - ئەگەر ئێك ئاخڤت، پاشێ ل خوە زڤڕی، ئەو ئاخڤتن ئەمانەتە)).

ب- دبت تشتێ سپارتی (ئەمانەت) مالەك بت، خودانی دانابتە دەڤ کەسەکی دەستپاك، دڤێت ئەو مال بێتە پارزتن، چونکی کەڤتە سەر بەختێ کەسێ مال ل دەڤ، نابت دەستێ خوە دانتە سەر و چەپ بکەت، چونکی دەستدانانە سەر و چەپکرن حەرامە، و نە ژ سالۆخەتێ مرۆڤێ موسلمانە. و نابت بێتە دزین ژی، چونکی دزی ب خوەژی حەرامە، بەلکو دڤێت ل خودانی ب خوە بێتە زڤڕاندن.

کریارا خیانەتێ و باوەری ل دەڤ ئێك مرۆڤی و د ئێك دەمیدا ڤێك ناکەڤن و کۆم نابن، بەلگە ژی گۆتنا پێغەمبەرییە ئەوا دبێژت: **((لایسرق السارق حین یسرق وهو مؤمن** - دزیکەر دزییێ ناکەت، و ئەو یێ باوەردار)).

ڤێجا ئەگەر مە بڤێت نموونەیەکی ڕاست و دیرۆکی بۆ مرۆڤەکی دەستپاك و پارێزکار و گەلەك ژ خوە ب باوەر و خەلك ژێ ب باوەر بینین، بێ گۆتنە، پێغەمبەرێ خودێ یووسف (سلاڤ لێ بن) وەك نموونە دڤێت بێتە ئینان، و هەروەکی قورئانا پیرۆز بەرچاڤ کری و و د دەرهەڤێ ویدا گۆتی: **((قَالَ اجْعَلْنِي عَلَى خَزَائِنِ الْأَرْضِ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ )**- گەنجخانەیان بکە د دەست مندا، ئەز مرۆڤەکی پارێزکار و زانامە) **(یوسف ٥٥)**.

ج- تێ هەیە دەستپاکی د فرۆتنێدا بت: نابت زەغەلی د مالیدا و د تشتێ فرۆتنێدا بێتە کرن، بەلکو دڤێت فرۆتن گونجایی بت د گەل پیڤکێن شەرعی.

پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) زەغەلییا زەلامەکی فرۆشیار دیارکر هەروەکی د فەرمۆدەیەکا پیرۆزدا هاتی، دەمێ د بەر کۆمەکا تشتێ خوارنێڕا بۆری و دەستێ خوە کرییە د ناڤدا و تلێن وی تەڕ بووین. ئینا گۆتە زەلامێ فرۆشیار، ئەڤە چیە فلان؟ ئینا چو د دەستاندا نەما، گۆتە پێغەمبەری: بارانێ لێ

کرییە. پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) گۆتێ: تە بۆچ نەددانا ب سەرڤە، دا خەلك ببینن؟ **((مَن غشَّ فليس مني** - یێ زەغەلییێ بکەت، نە ژ منە)).

پشتی خواندنا ڤی دەقێ پیرۆز، شیرەتا مە ل هەر فرۆشیارەکێ بت، کو تشتێ خوە بێ زەغەلی و بێ خیانەت بفرۆشت و فند و فێلان د بازارا خوەدا نەکەت.

## نیشانێن سالۆخەتێ دەستپاکییێ:

١- ناڤ و دەنگێ باش.

٢- باوەری د ناڤ خەلکیدا.

٣- دلبێشی د کاریدا.



## شەرم



ڕەوشتەکە بەرێ مرۆڤی ددەتە هێلانا خرابییان و کێماسینەکرنێ د دەرهەڤێ خودانهەڤیدا.

موسلمان ب سالۆخەتێ شەرمێ ژ غەیری خوە جودانە. شەرم مەزنترین و جوانترین سالۆخەتە کەسێ موسلمان پێ پێشچاڤ ببت. ئەڤ ڕامانە د وێ فەرمۆدەیا پێغەمبەریدا (سلاڤ لێ بن) دیارە ئەوا دبێژت: **((إن لكل دين خلقاً وخلقُ الاسلام الحياءُ – هەر دینەکێ ڕەوشتێ ڕەوشتێ خوە هەیە و ڕەوشتێ ئیسلامێ شەرمە))**.

شەرم سالۆخەتەکی جوانە، جوانییا ڕەوشتێ مرۆڤی زێدەتر لێ دکەت. هەچیێ جوانی بڤێت، دڤێت شەرمێ بکەتە د ناڤ ڕەوشتێ خوەدا، چونکی شەرم وەکی وان گولانە ئەوێن باخچە پێ دئێنە خەملاندن، و چاڤێن خەلکی ژ بەر جوانییا وان ژ باخچەیی فەنابن.

پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) ب ڤێ ڕامانێ پەسنا شەرمێ ددەت، دەمێ دبێژت: **((ماكان الفُحشُ في شئ قط إلاّ شانه، وما كان الحياءُ في شئ قطّ الاّ زانه - ئانکو: هەر تشتەکی خرابی و کریارا پیس د ناڤدا بت، ڕووڕەش و کرێتە، و هەر تشتەکی شەرم د ناڤدا بت، جوانە))**

و پێغەمبەر ب خوە (سلاڤ لێ بن) باشترین نموونەبوو بۆ سالۆخەتێ شەرمێ، ئەوی ب دەڤێ خوە یێ پیرۆز، شەرم کرییە پشکەك ژ باوەرێ.

## جوون و ڕەنگێن شەرمێ:

### أ- شەرم ژ خودێ:

شەرم ژ خودێ، بلندترین پێك و پەیسكێن شەرمێیە. ڤێجا تو – هەی ڤوتابییێ خوەشڤی، ڕۆژ ب ڕۆژ مەزن دبی و زانینا تە بەرفرەه دبت، تو دگەهییە وێ ئەنجامێ کو خودێ تو یێ چێکری و دایی و خێر و خوەشی و کەرەمێن خوە ب سەر تەدا داڕێتینە، و بەژنەکا کێل و جوان و گەلەك ڤووت و ڤنیات و خوارن و ڤەخوارنێن ڕەنگڕەنگ دایینە تە، و ڕێك و ڕێبارێن دەشت و دەریایێ بۆ تە خوەشکرینە، چ ب ڕێکا گیانەوەران بت، چ ژی ب ڕێکا گەمی و فرۆکەیان بت، ئەڤە هەمی دا تو نەوەستی و زەحمەت ب تە نەکەڤت.

ئەڤ خێر و خوەشی و کەرەمە هند گەلەکن، نائێنە هەژمارتن. ئەرێ ئەڤ خودایێ هۆسا ناندەه و بەرفرەهکەر هێژایی هندێ نینە، تو شەرم ژێ بکەی؟!

بەلێ. ئەگەر باوەر تە هەبت و وژدان د سنگێ تەدا ڤەلڤت، دێ بێژی: بەلێ. و پشتی تو تێگەهشتی، دێ شەرم کەی د گەل بکەڤییە ڕکێ، یان گوهداریا وی نەکەی، یان وی نەئینییە بیرا خوە... وژدان د سەرێ تەدا هشیار دبت و گازی دکەت و دبێژت: دڤێت ڤەنجی ب ڤەنجییێ بت... ئەرێ بەرئاڤلە، شوونا ڤەنجیا ڤەنجیکەری، ئەم خرابییێ لێ بکەین؟! ڤێجا ما بەرئاڤلە تو ژ وان کەسان بی، ئەوێن ڤەنجی نەئێتە بەر چاڤان؟

نەخێر، سروشتێ تە یێ مرۆڤاتییێ، تو یێ ب شەرمێ پەروەردەکری، نە جهێ باوەرێیە، تو شەرمێ بدەیە ڕەخەکێ و ڕکمانێ د گەل سروشتێ ژێگۆتی بکەی.

### ب- شەرم ژ دەیبابان:

ئەگەر تو ژ کوڕێن ب ئەدەب و پەروەردەکری بی، تو دێ ب چاڤێ شەرمێ بەرێ خوە دەیە دەیبابێن خوە و تو دێ سەرێ گوهدارییێ بۆ وان چەمینی، و دێ د هەر کارەکێدا و ب شەرم، دەستێ هاریکارییێ بۆ وان درێژکەی، و د نەخوەشی و نەساخییێدا دێ دیسا ب شەرم دەستێ وان گری، و ڕوویێن تە ناگرن، چوجا دەنگێ خوە ب سەر یێ وان بێخی، و خوە د گەل وان دژوار بکەی. سەربلندی و شانازییە بۆ تە، خوە د گەل وان سەرنەرم و گوهدار بکەی، چونکی تو هێژ بچووك، ڤان دەیبابان، دەستێن خوە ب سەرێ تەدا ئینایینە و د نەساخییا تەدا، گەلەجا شەڤ هەمییێ ئەو ل سەر تە مایینە هشیار و خەو ب چاڤێن وان نەکەڤتییە، و گاڤا تو برسیبایی، وان تو تێر دکری، و گەلەجا ژ دلپێڤەیی و دلسۆتن وان تو ب گەرمی یێ همبێزکری و داییە بەر سنگێ خوە.

جـ- شەرم ژ مامۆستا و پەروەردەکەران:

قوتابییێ خوەشڤی و قوتابییا ڤەدرگران، زمانێ تە بلا زمانێ شەرمێ بت د گەل مامۆستاییێن تە، ئەوێن گەلەك ڕەنگێن زانست و زانینان نیشا تە ددەن، و گەلەك پەروەردەیان ددەنە بەر تە، و دەمانا پاشەڕۆژەکا گەش ددەنە تە. بلا هەردەم ڕوویێ تە ڤەکری و گەش بت د گەل وان، بلا دەنگێ تە د گەل وان، هێدی و نزم بت. بلا دان و ستاندنا تە دەریایەکا سنج و ڕەوشتان بت، و بلا سەرەدەرییا تە د گەل فەرمانبەرێن قوتابخانەیا تە، یا مرۆڤان بت. بێ یاریکرن و خوە مژوولکرن، گوهدارییا وان و وانەیا وان بکەی، و ئەزموونان بێ زەغەلی ئەنجام بدەی، و ئەگەر مامۆستایەکی تە شیرەتەك ل تە کر، بێ مەدەرکی و ڕکمان و ترش و تەحلی ژێ وەربگرە، هەردەم دەستێ هاریکارییێ بە د گەل مامۆستایان، و بۆ هەر تشتەکی خێر و بەرژەوەندا قوتابخانەیا تە تێدا.

د- شەرم د ئاخڤتنێدا:

ژ دو ڕوویانڤە ئەم دێ بەحسێ ڤی جوونێ شەرمێ کەین:

یێ ئێکێ — یێ پەیڤان:

ئەگەر تو ئاخڤتی، ژ ئێکا شەرمێ کێم باخڤە، و بلا پەیڤێن تە ل دووڤ هەوجەیی و داخوازێ بن، ئاخڤتنێن مرۆڤی بهادارن، یارییان پێ نەکە و ئەرزان نەکە، و مافێ گوهداران بپارێزە، و ئاخڤتنێ وەسا درێژ نەکە، نەخوەشییێ ژێ ببینن و ژێ بڕەڤن. و بزانە، گەلەك ئاخڤتن ڕێخوەشکەرە بۆ کرنا خەلەتییێن شەرم ب دووڤە. و گەلەك یارییان نەکە، چونکی زێدەیاریکرن سامێ ناهێلت و مرۆڤی سار دکەت، و خرابییێ ل دەڤ مرۆڤی پەیدا دکەت، و د ئاخڤتنا خوەدە، خوە دووری پرپێژی و زمانڕەشییێ بگرە، دا تو ژ شەرمەنیخ و ڕسوایی و ساربوونێ بێیە پارزتن، و خوە نێزیکی جڤین و خەبەران ژی نەکە، کێماسی و شەرمزارینە.

یێ دویێ- دەنگ:

بلا دەنگێ تە ل دووڤ هەوجەیی و داخوازێ، گونجایی بت، دا گوهدار وەربگرت، و دەنگێ خوە د ڕوویێ واندا هند بلند نەکە، نەخوەشییا خوە ژێ ببینن. خودایێ مەزن د قورئانا پیرۆزدا، بەرێ مە ددەتە هندێ، ئەم دەنگێ خوە نزم بکەین: **((وَاغْضُضْ مِن صَوْتِكَ إِنَّ أَنكَرَ الْأَصْوَاتِ لَصَوْتُ الْحَمِيرِ ) — دەنگێ خوە نزم بکە، چو دەنگ ژ یێ کەران نەخوەشتر نینن). (لقمان١٩)**

هـ- شەرم د جلکاندا.

ئیسلامێ بۆ ژن و مێرێن موسلمان، دیمەنەکی جوان و هێژا د جلکاندا هلبژارتییە، نابت زەلامێ موسلمان د ڕاپێچانا خوەدا، شەرمێ باڤێژت و ژ نافکێ هەتا چۆکان دەربێخت، هەروەسا نابت ژنا موسلمان ژی، لەشێ خوە ژ بلی دێم و چاڤ و هەردو لەپان دیار بکەت. لێ بەلێ هندەك ژن ددەنە سەر ڤی سینۆر و پەژانێ شەریعەتێ ڤەبڕی، و دکەڤنە د خەلەتییێن ئاشکەرادا، چونکی خودایێ مەزن داخوازا خوەڕاپێچانێ کرییە، هەر وەکی ژ ڤێ ئایەتا پیرۆز دیار دبت: **((وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا)— بلا خەمل و جوانییا خوە، ژ بلی دێم و چاڤ و هەردو لەپان دیار نەکەن).(النور ٣١).**

# ڕاهێنان

## ڕاهێنانا (١)

١- فەرمۆدەیەکا پیرۆز بینە، موسلمانان ئاگەهدار بکەت، کو بەرئاقل نینە باوەر و دەهمەنپیسی ل دەڤ کەسەکێ و د ئێك دەمیدا ڤێك بکەڤن و کۆم ببن.

٢- فەرمۆدەیەکا پیرۆز بینە، داخوازا دەستپاکییێ بکەت د پارزتن و ڤەشارتنا ئاخڤتنا نهینیدا.

## ڕاهێنانا (٢)

١- نیشانێن سالۆخەتێ دەهمەنپاکییێ چنە؟

٢- دەستپاکی چیە؟

## ڕاهێنانا (٣)

بۆ هەر ڤالاییەکا بێت بەرسڤا ڕاستا د ناڤبەرا دو کەڤاناندا هلبژێرە:

١- موسلمانێ دەستپاك، کەسەکی .................. (مێڤانحەوینە - ناڤ و دەنگەکی باش هەیە - گەلەك زیرەك و زانایە).

٢- کەسێ جلکێ ڕەوشتێ شەرمێ بکەتە بەر خوە ............... (خوە پاك و پاقژ و جوان کر - خوە ڕووڕەش و کرێت کر - چو ئاڤاهی د خوە نەهێلا).

٣- ئەگەر کەسەکێ مالێ خوە وەك سپارتی دانا دەڤ غەیری خوە ............ (دورستە دەستێ خوە دانتە سەر - دڤێت بێتە پارزتن - دورستە د بەر خوەدا بمەزێخت).

٤- ئەگەر موسلمانی خوە ژ دەردێ دەهمەنپیسییێ دا پاش ...... (ژ کارلێکرنا وی هاتە پارزتن - پتر دێ ل بەر شرین بت - ئاقلێ وی دێ سڤك بت).

**ئەز دێ خوە ل سەر ڤان ڕاستییان ڕاگرم و خوە پەروەردەکەم:**

١- دەمێ ئەز بەرێ خوە ددەمە وان هەمی خێر و خوەشی و کەرەمێن ڕەنگڕەنگێن هاویردۆری خوە و ڤی ئەردێ تێر خەمل و خێز و ڤان سوولاڤێن دلکێش، ئەز ب سەر بۆشاتی و گەلەکیا دانا خودێ هلدبم و ب شەرمڤە سەرێ گوهدارییێ بۆ دچەمینم.

٢- دەمێ ئەز دڕێنمە دەیبابێن خوە و وێ هەمی وەستیانا ب خودانکرنا منڤە برین و وێ خەوا چاڤێن خوە ژ بەر نەساخیا من ژێ بێبار کرین و بەردەوام پاشەرۆژا من ژ پێش چاڤێن وان نەدچوو، ئەز ب سەر دلپێڤەییا وان هلدبم و ڤیانا وان ژ شەرماندا و بێی من، دچتە د دلێ مندا.

٣- دەمێ ئەز بەرێ خوە ددەمە مامۆستایێن خوە، ئەوێن زانست و زانین ب مەردینی پێشکێشی من کرین، ئەز ب سەر وی هەمی مفایێ مامۆستا دگەهینن هلدبم، و ب شەرمڤە سەرێ ڕێز و قەدرگرتنێ بۆ وان دچەمینم.

٤- دەمێ ئەز نەخوەشییا خەلکی ژ دەنگێ بلند دبینم، ئەز دزانم کا خەلك، چەند نەخوەشییا خوە ژ دەنگبلندییێ دبینن، هنگێ ئەز شەرم دکەم دەنگێ خوە بلند بکەم.

## وانەیا دەهێ

# بەرسڤدانا خرابییێ ب باشی و قەنجییێ



دڤێت مرۆڤێ موسلمان كارلێكرنا خوه د جڤاكا خوەدا هەبت. وەكی وی نۆژدار و پزیشكی بت ئەوێ نەساخ و نەخوەشان چارەسەر دكەت، و وەكی وی مامۆستایی بت، ئەوێ ب پەروەردەكرنا قوتابییێن خوه ڕادبت. ئەو ل بەر ڕاستەڕێیی و ڕۆناهییا پەیام و نامەیا موسلمانەتییا ڕاست و دورست پێگاڤان دئاڤێژت و ڕەفتارێن وی ژ ئەقلێ وی یێ ساخ و ساخلەم و ژ هەستێ وی یێ پاك و پاقژ دەردكەڤن. ئەو گوه نادەتە دەروونێ خوه دەمێ وی د بەر هندێڕا دكەت كو بەرسڤا خرابییێ ب خرابییێ بدەت، چونكی ئەڤ شێوازە دەربڕینێ ژ ڕووكارەكی دەمارگیری یێ نەزان دكەت. مرۆڤێ موسلمان خوه نائێختە د چەپەراندا دا بەرسڤا خرابان ب خرابی بدەت، بەلكو شێوازێ هەرە پەسەند ل دەڤ وی (بەرسڤدانا خرابییێ ب باشی و قەنجییێ)یە.

## هندەك كورتەچیرۆك و سەرهاتی ل دۆر (بەرسڤدانا خرابییێ ب باشییێ):

أ- برایێن یووسف (سلاڤ لێ بن) پیلانەك ژ بۆ كوشتنا برایێ خوە یووسف گێڕان، ڕابوون ئاڤێتنە د بیرەكا کووردا، پاشێ خودایێ مەزن ئەو ڕزگارکر و پشتی چەند سال و زەمانەکان بوو وەزیرێ دارایی ل وەلاتێ مسرێ. سال چوون و سال هاتن، و دەمەکی درێژ ب سەرڤە چوو، جارەکا دی پێك هاتنە دەر و پەشێمان بوون ل سەر وێ خەلەتییا وان د دەرهەقێ ویدا کری و داخوازا لێبۆرینێ ژێ کرن. یووسف پێغەمبەر ل وان بۆری و گەردەنا وان ئازاکر و داخواز ژ خودێ کر کو ل وان نەگرت. هەروەکی ژ ڤێ گۆتنا خودایێ مەزن دیار: **((قالوا تالله لقد آثرك اللهُ علينا وإن كنا لخاطِئين. قال لاتثريبَ عليكم اليوم يغفر اللهُ لكم وهو ارحم الراحمين)) (يوسف ٩١-٩٢). ئانكو: گۆتن ب خودێ، خودێ تو ب سەر مە ئێخستی و ب ڤەدرتر و بلندتر لێکری، و ب ڕاستی ئەم د ڕاستا تەدا خەلەت بووین. یووسف گۆت: ئەڤرۆ ئەز ل هەوە ناگرم، و من گازندە ژ هەوە نینە، خودێ ژی ل هەوە ناگرت، پشتی هەوە خەلەتییا خوە هەڤاندی و ئەو ژ هەمی دلۆڤانان دلۆڤانترە.**

ئەڤ لێنەگرتن و لێبۆرینا جوان د دەرهەقێ واندا، بەرسڤا باوەرداریێ خودانهێز و دەستهلاتدارە، بۆ وێ کۆما برایان، ئەوا پیلان ژ بۆ کوشتنا برایێ خوە گێڕایین.

ب - ئادەم پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دو کوڕ هەبوون (قابیل) و (هابیل). بوو شەڕەنیخ و جرە د ناڤبەرا هەردو کوڕاندا، گەهشتە ڕادەیا کوشتنێ، ئینا قابیل کوشتنا برایێ خوە هابیل کرە دلێ خوە، لێ بەلێ هابیل خوە ژ بەرسڤدانێ دا پاش، و نەڤیا شوونا خرابییێ خرابییێ بکەت، و گۆتنەکا ئاقلداران کر و گۆت، هەروەکی د قورئانا پیرۆزدا هاتی: ((لَئن بَسطْتَ اليّ يدَك لِتقْتُلني ما أنا بباسطٍ يديَ إليك لأقتلَكَ)) (المائدة ٢٨). ئانکو: ئەگەر تو بۆ کوشتنێ ژی دەستێ خوە درێژی من بکەی، ئەز بۆ کوشتنێ دەستێن خوە درێژی تە ناکەم.

ئەڤ بێنفرەهییا جوان، بەرسڤدانا باوەرداریێ پارێزکارە، بۆ وی برایێ کوشتنا برایێ خوە کرییە دلێ خوە.

پ - (أبو لهب) جیرانێ پێغەمبەرێ مە بوو (سلاڤ لێ بن)، ژ نەڤیان، هەردەم پیساتی و گلێشێ خوە دکرە بەر دەرگەهێ وی، پێغەمبەری ژی (سلاڤ لێ بن) گلێشێ وی ڕادکر و دگۆت: ئەڤە چ تۆڤ جیرانییە، هەی کوڕێ (عبد مناف)؟.

ئەها ئەڤ گازندەیا نەرم، بەرسڤا وی جیرانی بوو، ئەوێ گلێشێ خوە دڕێژتە بەر دەرێ جیرانێ خوە.

ت ـ ئيمام (حسن البصرى) بهيست كو مرۆڤەكێ نەكامييا وى (غەيبەتا وى) كرييە، ئينا ڕابوو سەلكەكا تەژى خورمە بەرهەڤ كر، و نامەيەك نڤيسى و دانا سەر دەرێ سەلكێ، و وى ب خوە و ب دەستێن خوە بۆ بر. د وێ نامەيێدا نڤيسيبوو: ((گەهشتە گوهێن من، كو تە خێرێن خوە يێن بۆ من كرينە ديارى، ڤێجا من ژى ڤيا تە خەلات بكەم)).

ئەڤ سەلكا تەژى خورمە، بەرسڤا باوەردارييە بۆ وى كەسێ نەكامييا براىێ خوە يێ موسلمان كرى.

ئارمانج ژ بەرسڤدانا خرابييێ ب باشى و قەنجييێ ئەوە: مرۆڤ خوە ژ خرابييا خرابان بپارێزت.



وانەیا یازدەیێ

## نیشانێن کارێ (بەرسڤدانا خرابییێ ب باشییێ)



١- لێبۆرین و چاڤگرتن ژ گونەهکاران.

٢- دلپێڤەیی و دلسۆتن د گەل کەسێ کەڤتی و بێ چارە.

٣- سەرەدەرییا نەرم بەرانبەری دژواری و ڕەقاتییێ.

**مفایێن باشێن ب کارێ (بەرسڤدانا خرابییێ ب باشییێ)ڤە دئێن:**

١-هەڤبەندییا دژمناهییێ دکەتە هەڤبەندییا ڤیان و هەڤالینییێ.

٢- کەسێ خرابێ دژمنکار دکەتە کەسەکی بێ بەلا و گونجایی.

٣- ڤیانا ب هێز زێدە دکەت پشتی پێکهاتنێ.

٤- جڤاکێ ئاڤا دکەت و ئاگرێ دەمارگیری و نەزانینێ ڤەدمرینت.

٥- دڤێ کەسێن ڕکۆ و بێڕێ ددەتە ئێك و ناهێلت ئاخفتنێن کرێت ژ دڤێ وان دەرکەڤن.

مفا و شوونوارێن بۆری، پەندیارییا خودایێ مەزن د پەروەردەکرنا کۆما موسلماناندا و نەمازە د ڕەوشتێ (**بەرسڤدانا خرابییێ ب باشییێ**) دیار دکەت.

ڤی سەردەمی نەمازە پشتی زێدەبوونا ئالاڤێن شارستانییا نوو، خەلك زێدە پێڤە مژوول بوو، و هەر ژ بەر ڤێ چەندێ، ژ بەرێ پتر ئارێشە و گرفتاری پەیدابوون. بۆ نموونە: پێشتر مۆبایل نەبوون، وەکی ڤێ گاڤێ گەلەك پێڤە مژوول ببن و نەخوەشییێ پێ بگەهینن غەیری خوەژی. و باشترین بەرسڤ ئەڤرۆ بۆ کەسێن ب ڤێ مۆبایلێ غەیری خوە دئێشینن، بەرسڤنەدان و سەبرکێشانە. پەندەکا کەڤن و بەلاڤ هەیە دبێژت: (بەرسڤا ئەحمەقی خوەبێدەنگکرنە).

## هندەك ئاوایێن ڤێ بەرسڤدانا جوان بۆ كەسێن خراب:

١- بەرسڤا كەسێ پشتا خوە بدەتە مرۆڤانییێ، مرۆڤگرتنە.

٢- بەرسڤا سلاڤنەكەری سلاڤكرنا وییە.

٣- بەرسڤا جڤین و خەبەران خوەبێدەنگكرن و لێبۆرینە.

٤- بەرسڤا كەسێ تنگژی و كەربگرتی، بێنفرەهی و نەرمییە.

٥- بەرسڤا كەرب ژێ ڤەبوونێ، خوەشی و رێزگرتنە.

٦- بەرسڤا خوەترش و تەحلكرنێ ناڤچاڤڤەكرن و رووخوەشییە.

٧- بەرسڤا زكرەشییێ دیاری و خوارندانە.

٨- بەرسڤا كەسێ رکۆیی و نە گەلەك ئاسێ د هزرێن خوەدا راستەرێكرنا وییە. و بەرسڤا یێ گەلەك ئاسێ خوەژێدانەپاش و دووركەڤتنە.

٩- بەرسڤا رێبارێ گەلەك ب لەز، رێ بۆ ڤەكرن و بەردانە.

١٠- بەرسڤا كەسێ مایتێكەر، ئەوێ مایێ خوە د شۆلێ غەیری خوە دكەت، گوهداریكرن و پێنەكرنە.

١١- بەرسڤا كەسێ دین، هێلان و خوەتێنەگەهاندنە.

١٢- بەرسڤا كەسێ د خوەدا ئاڤا و گەلەك ب خوە شایی - ئەوێ پووتەیی ب غەیری خوە نەكەت - راوەستاندنا وییە ب وان پسیارێن پێ بێتە بێدەنگكرن، دا ل خوە بزڤرت و مەزناتییێ بهێلت، یان ژی بەرسڤا وی ئەوە گەنگەشە د گەل نەئێتە كرن و ڤاویش د گەل نەئێتە كێشان.

١٣- بەرسڤا كەسێ ژ رێ دەركەڤتی، زڤراندنا وییە ب ئاخاڤتنا نەرم و نیشادانا رێز و تەرتیبانە.



## ڕاهێنانا ئێکێ

١- ئارمانج ژ (بەرسڤدانا خرابییێ ب باشییێ) چیە؟

٢- بەحسێ هندەك ئاوایێن بەرسڤدانا خرابییێ ب باشییێ بکە د ڕاستا کەسێن خرابدا.

٣- سێ ژ مفایێن باشێن (بەرسڤدانا خرابییێ ب باشییێ) بنڤیسە.

## ڕاهێنانا دویێ

بۆ هەر ڤالاییەکا بێت بەرسڤا ڕاستا د ناڤبەرا دو کڤاناندا هلبژێرە:

١- ئەگەر ئەز ب مێڤانی چوومە مالا جیرانێ خوە و ژ بەر ئەگەرەکێ ئەز نەحەواندم ......... (هەتا هەتا د گەل نائاخڤم - جارەکا دی دێ سەرادەم – دێ گازندەیان ژێ کەم ژ بەر نەحەواندنا من وەك مێڤان).

٢- ئەگەر تورمبێلەکێ ل تورمبێلا مە دا و شووفێرێ وێ ل دووڤ یاسایا هاتن و چوونێ گونەهکاربوو........ (ئەز دێ ب دژواری حسێبێ د گەل شووفێری کەم – ئەز ل شووفێری نابۆرم – دێ بێنا خوە فرەه کەم و ل شووفێرێ گونەهکار ناکەمە ڤێرِی و دێ خوە ل بڕیارا یاسایا هاتن و چوونێ گرم و پێ ڕازی بم).

## ڕاهێنانا سێیێ

ب ئاوایەکی گونجایی ستوونا دویێ ب ستوونا ئێکێڤە گرێبدە:

| | |
|---|---|
| ١– کارێ بەرسڤدانا خرابییێ ب باشییێ هەڤبەندییا دژمناهییێ دکەتە | ئاگرێ دەمارگیری و نەزانینێ ڤەدمرینت |
| ٢– کارێ بەرسڤدانا خرابییێ ب باشییێ | ب خوەشی و ڕێزگرتنێ ددەت |
| ٣– مرۆڤێ موسلمان بەرسڤا ئەوێ پشتا خوە ددەتە مرۆڤێ خوە | هەڤبەندییا ڤیانێ |
| ٤– مرۆڤێ موسلمان بەرسڤا کەرب و نەڤیانێ | ب گرتنا مرۆڤانییێ ددەت |

## ڕاهێنانا چارێ

١- چیرۆکەکێ ژ ژیانا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) بینە، ببتە بەلگە ل سەر بەرسڤدانا خرابییێ ب باشییێ.

٢- سەرهاتییەکا ڕاست ژ جڤاکا کوردەوارییێ بینە، کو کەسەکێ تێدا بەرسڤا خرابییا کەسەکێ ب باشییێ دابت.

## بزاڤ و چالاکی:

- مامۆستا دێ داخوازێ ژ قوتابییان کەت، کو ئێك ژ وان بەحسێ کەسەکێ بکەت، خرابی د ڕاستا ویدا کربت، و وی ب باشی لێ زڤراندبت.

- مامۆستا داخوازێ ژ قوتابییێن خوە بکەت، دو قوتابی ب دان و ستاندن بەحسێ ڕوودانەکێ بکەن، ئێك ژ وان ب ڕۆلێ کەسێ خرابی کری ڕابت، و ئەوێ دی، ب ڕۆلێ کەسەکێ ڕاببت، بەرسڤا خرابییێ ب باشییێ بدەت.

## وانەیا دوازدەیێ

# شیرەتێن قورئانی



قورئانا پیرۆز کا چاوا ژێدەر و سەرۆکانییا یاسادانان و فەرمانانە، هەروەسا ڕێبەر و ئاڕاستەکەر و دیارکەر و ڕاستەڕێکەرە، بەرێ مرۆڤێ موسلمان و گشت خەلکی ددەتە هەر خێر و خوەشییەکا بەرژەوەندا دنیا و ئاخرەتێ تێدا. هەقی و نەهەقییێ ژێک جودا دکەت و بەرێ مە ددەتە ڕێکا ڕاست و دورست. چیرۆکێن مللەتێن کەڤن و سەرهاتییێن بۆری تێدانە، هندەکان ژێ ب درێژی بەحس دکەت و ئەو چام و شیرەت و ڕاستەڕێکرنا تێدا بەرچاڤ دکەت، وەکی وێ شیرەتا لوقمان ل کوڕێ خوە کری، ئەو شیرەتا هەتا هەتا و هندی دنیا هەیە دێ ساخ مینت. ئەڤە پشکەکا بچووکە ژ وێ هەمی بەرفرەهی و پەندیارییا قورئانێ. خودایێ مەزن د سۆرەتا لوقماندا دبێژت: (( **يَا بُنَيَّ أَقِمِ الصَّلَاةَ وَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ وَانْهَ عَنِ الْمُنكَرِ وَاصْبِرْ عَلَى مَا أَصَابَكَ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ (١٧) وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحًا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ (١٨) وَاقْصِدْ فِي مَشْيِكَ وَاغْضُضْ مِن صَوْتِكَ ۚ إِنَّ أَنكَرَ الْأَصْوَاتِ لَصَوْتُ الْحَمِيرِ(١٩)** )). لوقمان ب زمانێ شیرەتێ دبێژتە کوڕێ خوە: کوڕێ من، نڤێژێن خوە بکە و ل وەخت ب جه بینه، و ب ئاوایەکی وەسا کو ڕازیبوونا خودێ تێدا بت. کوڕێ من، ژ بیرنەکە، بلا

کارێ ته هەردەم، فەرمانا کرنا باشی و قەنجییێ بت، و خوە دووری هەمی خرابی و گونەه و کرێتییان بگرە، دا جڤاك پاقژ و ڕاستەڕێ ببت و بەختەوەری بکەڤتە ژین و ژیارێ. کوڕێ من، د تەنگاڤییاندا و ل سەر ڕاستەڕێیی و جهێینانا فەرمانان، بێنفرەهـ بە، و خوە ب کرنا ڤان هەمی کار و کریاران ژی بکە و خوە ژێ نەدە پاش.

هەروەسا شیرەتکار کو پشتا خوە نەدەتە کەسێ، و خوە بۆ غەیری خوە خزمەتخوەش بکەت، و مەزناتییێ نەبتە بەرێ خوە، چونکی خودێ حەز ژ وان کەسان ناکەت، ئەوێن خوە ل سەر سەرێ خەلکی مەزن دکەن و خەلکی بچووك دبینن.

هەروەسا شیرەتکار کو د ڕێڤەچوونا خوەدا نە خوەش ب ڕێڤە بچت، نەژی سست، ڕێڤەچوونا وی د ناڤبەرا هەردویاندا بت، دا ژ ڕێز و ئەدەبێ دەرنەکەڤت. و دەنگێ خوەژی گەلەك بلند نەکەت، و هێدی و ل سەر خوە باخڤت، چونکی دەنگێ بلند و ڤێڕی، نەخوەشییێ بۆ خەلکی چێ دکەت، و خودایێ مەزن ئەڤ دەنگە ب نەخوەشترین دەنگ شەبهاندییە، کو زڕزڕا کەرانە.



## ڕاهێنان

## (١)

**بەرسڤا ئەڤێن خوارێ بدە:**

١-   بۆچ قورئانا پیرۆز شیرەتا لوقمان ل کوڕێ خوە کری، بۆ مە بەرچاڤ کرییە؟

٢-   بەحسێ هندەك باشی و قەنجییان بکە، کو پێدڤییە پێگیری و فەرمان پێ بێتە کرن.

٣-   لوقمان ل دۆر ڕێڤەچوونێ، چ گۆتە کوڕێ خوە؟

٤-   ناڤێ وێ سۆرەتێ بێژە، ئەوا شیرەتا لوقمان تێدا.

## ڕاهێنان

## (٢)

**ڤان ڤالاهییان ب دەستەواژەیێن گونجایی تەژی بکە:**

١- تشتێ ژ هەمییان گرنگتر کو مرۆڤێ موسلمان بکەت و پێ ڕابت ..............

٢- قورئانا پیرۆز ئاخڤتنا ......... بۆ پێغەمبەرێ خوە .................. (سلاڤ لێ بن) هنارتییە دا ببتە یاسا و دەستوور بۆ هەمی ........

٣-   ........... علی ما أصابك، ان ذلك من ....................



## لێنەگرتن و لێبۆرین

لێبۆرین و لێنەگرتن ئێك ژ ڕەوشتێن مرۆڤییە و بابەتەكی هەرەگرنگە ژ بابەتێن ڕەوشتناسییێ. ژ بۆ كو ڕەفتارێ مرۆڤی گونجایی بت د گەل نافەڕۆكا شەریعەتی، دڤێت مرۆڤی بارەك د ڤی سالۆخەتیدا هەبت.

ڤێجا لێبۆرین و لێنەگرتن و سنگفرەهی ژ وان سالۆخەتێن باشێن كەسییە، ئەوێن د چارچۆڤەكی گشتیدا بەر ب ئارمانجەكا دیاركری و مەرەمەكا ڤەبڕی دچت. هەر ڕەوشتەكێ ل دەڤ مرۆڤی چار ڕامان هەنە:

١- كارێ جوان و كارێ كرێت.

٢- شیانا كرنا هەردویان.

٣- ناسینا هەردویان.

٤-دل د كرنا ئێك ژ هەردویان، چ یێ جوان، چ ژی یێ كرێت.

خودایێ پاك و پاقژ هەمی ڕەوشتێن پاك و ب ڕوومەت د ئێك ئایەتا سۆرەتا (الاعراف) دا كۆمكرینە، كو ئەڤەیە: **(خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ)**. (الاعراف ١٩٩)

ئەڤ ئایەتا هە، هەمی ڕەوشتێن باش و ب ڕوومەت ڤەدگرت. د گەل كورتی و ئاشكەراییا وێ د نەخشەدانانا ڕێبازا ڕەوشتەكی سەرڕاست و دورستدا ژ بۆ تێكلی و سەرەدەریكرنێ د گەل خەلكی، چو ئایەت د قورئانێدا نینن، وەكی وێ هەمی ڕەوشتان ڤەگرن.

### بنەمایێن ڕەوشتی د سەرەدەریكرنا خەلكیدا:

ئایەتا بۆری سێ بنەما تێدانە ژ بۆ سەرەدەریكرنا خەلكی:

١- بنەمایێ ئێكێ – كرنا تشتێ ژ هەمییان بارسڤكتر:

ئەوە مرۆڤ كاروباران ب ئاوایێ سانەهیتر و بارسڤكتر ئەنجام بدەت، بێ ئالۆزكرن یان ئاسێكرن یان زەحمەت.

ئانكو: (ب سانەهی بێخت و چو ئیشك و گرێكان نەئێختێ).

( ب نەرمی بچتێ و ئاسێ نەكەت).

(لێبۆرین تێدابت و ڕەقاتی د نافدا نەبت).

و ئەڤە هندێ ژی دگرت (تو مرۆڤانییا وی بكەی، ئەوێ پشت داییە تە، ل وی كەسی ببۆری ئەوێ ستەم د دەرهەڤا تەدا كری، دەستێ دانێ بۆ وی كەسی ڤەكەی، ئەوێ تو ژێ زڕباركری). و هەر كارەكی دی یێ باشێ ل سەر بنیاتێ لێبۆرین و سنگفرەهی و ب سانەهیئێخستنێ ئاڤاكری.

٢- بنەمایێ دویێ — فەرمانا کرنا باشییێ:

ئەگەر سەرەدەری و تێکلییا نەرم وە ل هندەکان بکەت کو ل سەر پێ خوە بچن، و بەدرەوشتییا وان بەرێ وان بدەتە پشتەرێیی و ژ رێدەرکەفتنێ د روویێ کەسێ رەفتارنەرمدا، خودایێ مەزن د گەل هندێ ژی، داخواز ژ پێغەمبەری کرییە، کو هەر فەرمانا کرنا باشییێ بکەت د چارچۆڤێ وان بڕیار و فەرمانێن شەریعەتیدا، ئەوێن بەرێ مرۆڤی ددەنە هەر باشییەکێ و مرۆڤی ژ هەر خرابی و نەباشییەکێ ددەنە پاش.

٣- بنەمایێ سێیێ — خوەدوورئێخستن ژ نەزانان:

دوور نینە هندەك بێمەژی، وان کەسێن بەرێ وان ددەنە باشییێ و داخوازێ ژ وان دکەن کو روویێ خوە ژ خرابییێ وەرگێڕن، ئێزا بدەن و بئێشینن، هەتا ئەڤێن هە ژی دڤێت ئەم بەرسڤا وان ب نەزانین و جڤین و تەعداییکرنێ نەدەین؛ بەلکو دڤێت د روویێ واندا ئەم خوە ڕاگرین و خوە ژ خرابییا وان بدەینە پاش و بێنا خوە ل سەر بەدرەوشتییا وان فرەھ بکەین، (ب وێ مەرەمێ کو ئەم خوە و رێز و روومەتا خوە بپارێزین، و خوە بەرهنگاری نەفامی و بێمەژییاتییا وان نەکەین، بەلکو ئەو ب خوەژی، ب هندێ، ل خوە بزڤڕن و هزرا خوە د نەفامییا خوەدا بکەن و بهێلن).

ڤان هەرسێ بنەمایان ئەگەر خەلك خوە پێ بکەن، کەرب و کین و نەڤیان و بێوژدانی د ناڤبەرا واندا نامینن، و دێ ژ ئێکدو ڕازی بن، و تەناهی و دلساخی و گونجان دێ کەڤتە ناڤ وان.



## وانەیا چاردەیێ

### نەرمی و دلپێڤەیی و دلۆڤانییا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن)

باشترین نیشان و بەلگە ل سەر باشییا پێگیرییێ ب هەرسێ بنەمایێن پێشتر، ئەوێن د وانەیا بۆریدا هاتینە بەحسکرن، ئەوە خودایێ مەزن کەرەمەکا مەزن د گەل باوەرداران کر، پێغەمبەرەکی نەرم و دلۆڤان و ژ هەمی سالۆخەت و ڕەوشتێن نەباش و ڕەق پاك و پاقژ بۆ وان هنارت. خودایێ مەزن د دەرهەقێ ویدا د سۆرەتا (آل عمران/١٥٩) دبێژت: ((فَبِمَا رَحْمَةٍ مِنَ اللَّهِ لِنْتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنْتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانْفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ )).

ئانكو: نەرمی و دلپێڤەییا تە بۆ مللەتێ تە، دلۆڤانییەکە خودێ ب تە و وان بری، ئەگەر تو مرۆڤەکی بەدرەوشت و هشك و دلڕەق و ئەنیگرێ بایی، دا ژ تە ڕەڤن و خوە ژ تە دەنە پاش، ڤێجا ل وان ببۆرە و داخوازێ ژ خودێ بکە، ل گونەهێن وان ببۆرت، د کار و بارێن خوەدا پسیارا خوە ب وان بکە، و ئەگەر تە تشتەك کرە دلێ خوە، پشتا خوە ب خودێ گرێبدە. ئانکو ب ڤی ئاوایی سەرەدەرییێ د گەل وان بکەت:

١- ل هەر کەسەکی خرابی و نەخوەشی گەهاندییێ، ببۆرت.

٢- داخوازا گونەهـ ژێبرنێ بۆ هەر کەسەکی گونەهکار بکەت.

٣- د وان کاروباراندا، ئەوێن وەحی پێ نەهاتی، پسیارا خوە ب وان بکەت.

پسیارپێکرن و مشێورەت فەرمانەکە شەریعەتا ئیسلامێ بڕیار پێ داییە، و ژ بەر وی زێدەمفاییێ دگەهینتە کەس و کۆمان، داخواز کرییە پێگیری پێ بێتە کرن. ئەگەر مە بۆ تشتەکێ پسیارا خوە ب غەیری خوە کر و د گەل هەڤالێن خوە مە دان و ستاندن کر و ڕاست و نەڕاست مە ژێك ڤاڤارتن، هنگێ دڤێت ئەم پشتا خوە ب خودێ گرێبدەین و وی تشتی بکەین، ئەوێ مە کرنا وی کرییە دلێ خوە، چونکی خودێ ب خوەژی حەز ژ وان کەسان دکەت ئەوێن پشتا خوە پێ گرێددەن و دەستێ وان ژی دگرت و ڕێکا ڕاست و دورست نیشا وان ددەت.

### چەند نموونەیەك ژ مشێورەتا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) د گەل هەڤال و هۆگرێن خوە:

پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) مشێورا خوە د گەلەك کاروباراندا ب هەڤال و هۆگرێن خوە کرییە، ژ وان بۆ نموونە:

١- دەمێ ڕۆژا بەدر بەرهنگاری كاروانێ قورەیش بوویی.

٢- دەمێ ڕۆژا (ئوحود) ژ باژێرێ مەدینەیێ دەركەڤتی.

٣- دەمێ بۆ شەڕێ (ئوحود) دەركەڤتی، و ل وان كەسان ژی بۆری، ئەوێن بۆ دەركەڤتنێ، خوە نەدایینە د گەل.

## لێنەگرتنا خرابییێ بەرانبەری كرنا خێرێیە:

خودایێ مەزن د قورئانا پیرۆزدا دبێژت:

**((إِن تُبْدُوا خَيْرًا أَوْ تُخْفُوهُ أَوْ تَعْفُوا عَن سُوءٍ فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ عَفُوًّا قَدِيرًا)) (سورة النساء ١٤٩).**

بنێرە ڤوتابییێ خوەشڤی و ڤوتابییا ڤەدرگران:

خودایێ مەزن چاوا كرنا خێرێ (چ ئاشكەرا و چ نەپەنی) بەرانبەری لێبۆرین و لێنەگرتنێ كرییە ژ هەر خرابییەكا دگەهتە مە. دەمێ ئەڤ سالۆخەتە ل دەڤ مە پەیدا دبت، هنگێ ئەو دبتە نیشان و بەلگە ل سەر ڕەوشتباشی و خوەشمرۆڤییا مە. دەمێ ئەم ل خرابییا وی كەسی نەگەڕین، ئەوێ خرابی و نەباشی د گەل مە كری، ئەها هنگێ سالۆخەت و ڕەوشتێن مە دێ بنە ئەو، ئەوێن فەرمان ژ بەرێ خودایێ مەزنڤە پێ هاتییە دان.

**(وێنەیێ بەرچاڤ وێ بەرانبەرییێ ئاشكەرا دكەت ئەوا د ناڤبەرا كرنا خێرێ و لێبۆرینا خرابییێدا)**



## دان و ستاندن

أ- (دڤێت ئەم خوە ژ نەزانان بدەینە پاش) ژ بەر چ؟

ب- ئەگەر پەیڤا (ب زەحمەتئێخستن) هەڤدژێ وێ (ب سانەهی ئێخستن)بت.

ئەرێ پا هەڤدژێ ڤان هەردو پەیڤان چیە؟

| ئاسێکرن | |
|---|---|
| ڕەقاتی | |

- کیژان چێترە لێبۆرین ژ خرابییێ یان کرنا باشییێ (چ ئاشکەرا و چ نەپەنی)؟.

ئاخڤتنا خوە ب دەقەکی قورئانێ پشتگەرم بکە.

- نموونەیەکێ بۆ هەر ئێك ژ ئەڤێن خوارێ بینە:

١- مشێورا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) د گەل هەڤال و هۆگرێن خوە.

٢- لێنەگرتنا کەسێن ب یا وی نەکرین.

- هەر چار ڕامانێن ڕەوشت ل دەڤ مرۆڤی ددەت چنە؟ بنڤیسە.

- ئەو چ ئایەتە هەمی ڕەوشتێن پاك و ب ڕوومەت تێدا هاتینە کۆمکرن؟

أ- وێ ئایەتێ بنڤیسە.

ب- ئەو ئایەت، د کیژ سۆرەتێدا هاتییە و هەژمارا وێ چەندە؟.

ج- وێ ئایەتێ سێ بنەما تێدانە، چنە؟.

- خودایێ مەزن داخواز ژ پێغەمبەری کر چاوا سەرەدەرییێ د گەل مللەتێ خوە بکەت؟.

- دەقەکی قورئانی بینە، بەلگە و نیشان بت ل سەر نەرمی و دلپێڤەیی و دلۆڤانییا پێغەمبەری.

## وانەیا پازدەیێ

### پارزتنا زمانی ژ خرابیێ

گۆتنا ئاخفتنا خێرێ و یا ڕاست و باش ژ نیشانێن باوەردارییا خودانێ گۆتنێیە، و ژ ئەنجامێن پەروەردەیا ڕاست و دورستە، و مفایێ وێ بۆ هەمی جڤاکێ ڤەدگەڕت. ئەگەر مرۆڤ پشتی هزرکرنێ و هشیارانە باخڤت و عەقلێ خوە ب بەر زمانێ خوە بێخت ئانکو بدەتە پێشییا وی، دێ سەرێ خوە تەنا کەت و دێ ل دەڤ خەلکی بتە جهێ باوەرێ و دێ ڤیانا وان ژی ب دەست خوەڤە ئینت و دووماهییێ دێ خودایێ خوەژی ژ خوە ڕازی کەت و دێ ل دەڤ وی ژ مرۆڤێن ڕاستگۆ ژی ئێتە هەژمارتن. لێ بەلێ ئەگەر خوە دەڤبەردایی کر، بێ کو زمانێ وی ب تشتەکێ بێتە گرێدان یان هەڤسارکرن، هنگێ دێ کۆمەکا نەخوەشی و ئێشك و گرفتارییان بۆ پەیدا بت، و دێ زیانێ گەهینتە خوە و گەهینتە خەلکی ژی و دووماهییێ دێ بتە ئەگەرێ هندێ کو ب بەر کەرب و نەڕازیبوونا خودێ بکەڤت.

و کەسێ زمانێ خوە ژ پڕبێژییێ نەدەتە پاش یان دوور نەئێخت، دێ کەڤتە د گەلەك خەلەتی و نەڕاستییاندا. ڤێجا هەروەکی دبێژن: ئەگەر ئاخڤتن ژ زیڤی بت، نەئاخڤتن و دەنگنەکرن ژ زێڕییە. ئەڤەیە ڕێك و ڕێباز و ڕەوشتێ خوەشمرۆڤ و باوەردار و ئاقلداران، چونکی هەر ئاخڤتنەکا ژ دەڤێ مرۆڤی دەرکەڤت، ل دەڤ خودێ، زێرەڤانەك ل بەر ڕاوەستاییە دنڤیست. و هەر د ڤی واریدا، پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) دبێژت: **((من كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليقل خيراً أو ليصمت))**. ئانکو کەسێ باوەری ب خودێ و ڕۆژا دووماهییێ هەبت، بلا ئاخڤتنا خێرێ بکەت یان ژی بلا خوە بێدەنگ بکەت.

و زمان کا چاوا دەمێ دئێتە هەڤسارکرن ژ خرابییێ، ئالافێ خێرێ و مفاگەهاندنێیە، ئەها وەسا دەمێ دئێتە بەردان، و زێرەڤانییا خودێ ژ بیرا خوە دبت، دبتە ئێش و ئاتافەکا کوژەك و وێرانکەر. ژ وان ئێش و ئاتافێن بەردان و هەڤسارنەکرنا زمانی ل پشت:

أ - **درەو**: گەڕاندنا زمانییە بێ کو سکر و ڤەدەغەکەرەك ڕاوەستینت یان ڕاگرت و بێ کو مەرەما وی ببتە گۆتنا ڕاستییێ. پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: **((كفى بالمرء كذباً أن يحدث بكل ماسمع))**. ئانکو بەسی مرۆڤییە درەو، هەر تشتەکێ مرۆڤ ببهیست بێژت. هندی درەوە خودانێ خوە ڕسوا و شەرمزار دکەت و خەلکی ژی وەسا ژێ بێ باوەر دکەت کو چو پووتە ب ئاخڤتنا وی نەئێتە کرن و چو بار و پشتی ژێ نەئێنە ڕاکرن.

ب - **نەکامی**: ئەوە بەحسێ کەسێ نەئامادە ب وی تشتێ پێ نەخوەش بێتە کرن، د پشتڕا و ل دەڤ کەسەکی دی، یان ژ درەو تشتەك ب دووڤە بێتە کرن یان ژی بێبەختی لێ بێتە کرن، و ئەڤە هەمی ب زمانی، ب وێ پارچەگۆشتا بچووکا د دەڤێ مەدا.

ئاخفتن گوهازتن: سالۆخەتەکی پیس و کرێتە، خودانێ خوە دکەتە مرۆڤەکی دوڕوو، ئاخفتنێ د ناڤبەرا دو کەساندا ڤەدگوهێزت، یا هەر ئێکێ بۆ یێ دی دبەت. ئەڤە هندێ دگەهینت کو کەسێ ئاخفتنێ بۆ تە ڤەگوهێزت، پشتڕاست بە، دێ ئاخفتنا تە ژی بۆ غەیری تە ڤەگوهێزت.

ج – **بێبەختی، نەوەیی (شادەزوور)**: ئەوە مرۆڤ خوە بێ وژدان بکەت و ئاخفتنەکێ ژ نك خوە چێ بکەت و ب بێ بەختی، ژ کیسێ هەر کەسەکێ بێژت یان بکەت و وی کەسی دەست تێدا نەبت. ئەڤە ژ پیسترین و خرابترین ئێش و ئاتافێن زمانییە و ژ گونەهێن مەزنە. کەسێ خوە پێ بکەت یان بکەڤتێ، مالا خوە و یا غەیری خوەژی وێران دکەت.

ڤێجا کوڕ و کچێن مەیێن قوتابی و ڤەدرگران، هشیاربن، زمانێ خوە ژ ڤان ئێش و ئاتافان بپارێزن، زمانێ خوە هەردەم ب ئینانا ناڤێ خودێ تەڕ و تۆل بکەن و ژ گۆتنا خێرێ و ڕاستییێ بێبار نەکەن، و بکەنە ڕێك و ئالافەك بۆ تێکگەهشتن و ڤیان و براتییێ. هندی زمانە، ئەو دەوارە یا مرۆڤ لێ سوار، یان دێ مە بەتە بەهەشتێ، یان ژی دێ مە بەتە ئاگرێ دۆژەهێ. ئەرێ ما نە بڤر و داسا زمانییە هەروەکی د فەرمۆدەیەکا پێغەمبەریدا هاتی، خەلکی گرێل دکەتە د ناڤ ئاگریدا. ڤێجا هندی زمانە، گاڤا تە پارازت، دێ تە پارێزت و گاڤا تە سڤك و بێ بها کر، دێ تە بێ قەدر و شەرمزار کەت.

و ئاخفتنا ژ هەمییان باشتر ئەوا د دەرهەڤێ زمانیدا هاتییە گۆتن، ئەو گۆتنە ئەوا دبێژت: (سەنگا مرۆڤی د ڤان هەردو تشتێن بچووکدایە: دل و زمان). و پێغەمبەر ژی (سلاڤ لێ بن) د فەرمۆدەیەکێدا دبێژت: ((**عليكم بالصدق فان الصدق يهدي الى البر وان البر يهدي الى الجنة واياكم والكذب فان الكذب يهدي الى الفجور، وان الفجور يهدي الى النار**)). ئانکو: ڕاستییێ بگرن، هندی ڕاستییە، بەرێ مرۆڤی ددەتە باشییێ، و هندی باشییە، بەرێ مرۆڤی ددەتە بەهەشتێ. و هشیاربن، خوە ب درەوێ نەکەن، هندی درەوە، بەرێ مرۆڤی ددەتە خرابییێ، و هندی خرابییە، بەرێ مرۆڤی ددەتە ئاگری.



## ڕاهێنان (١)

د ڤان هەردو ستوونێن خوارێدا، دەستەواژەیێن ستوونا ئێکێ و یێن ستوونا دویێ ب ئاوایەکی گونجایی بگەهینە ئێك و پێکڤە بکە:

| ستوونا ئێکێ | ستوونا دویێ |
|---|---|
| کەسێ گەلەك باخڤت | دل و زمان |
| دڤێت قوتابی | باشییێ و بەهەشتێ |
| درەو | نەئاخڤتن ژ زێڕییە |
| سەنگا مرۆڤی د ڤان هەردو تشتێن بچووکدایە: | دێ گەلەك خەلەتییان کەت |
| ئەگەر ئاخڤتن ژ زیڤی بت | ژ نیشانێن ژ ڕێ دەرکەڤتنێیە |
| ڕاستی بەرێ مرۆڤی ددەتە | زمانێ خوە ژ بێبەختییێ بپارێزت |

## ڕاهێنان (٢)

بەرسڤا ئەڤێن خوارێ بدە:

١- ئەرێ خەلك قەدرێ مرۆڤێ درەوین دگرن؟

٢- ڤێ ئایەتێ تەمام بکە: ((ما يلفظ .......................... عتيد)).

٣- ناڤێ سێ ئێش و ئاتافێن زمانی بێژە؟

٤- ئەرێ باوەردارێ ڕاستگۆ جهێ وی دێ چ بت؟

٥ – جودایی د ناڤبەرا نەکامی و ئاخڤتن گوهازتنێدا چیە؟

٦ – مەرەم ژ بێبەختی و نەوەییێ (شادەزووری) چیە؟

**بزاڤ و چالاکی:**

- فەرمۆدەیا ل دۆر ڕاستییێ ژ بەر بکە.

- مامۆستا دێ داخوازێ ژ قوتابییان کەت، کورتەڕاپۆرتەکێ ل سەر ئێش و ئاتافا درەوێ بەرهەڤ بکەن.

## وانەیا شازدەیێ

# مافێ ڕێکێ




ڕێك مافەکی گشتییە بۆ هەر کەسەکێ، نابت کەس بۆ مەرەمێن خوە یێن کەسی ب کاربینت یان خەلکی پێ بئێشینت؛ لێ تێ هەیە هندەك - زەلام و گەنج و ژن - نەچار ببن ل سەر ڕێك و ڕێباران بڕوونن، ئەڤا ل ئێرە ئیسلام ڕێکێ ل وان ناگرت، بەلکو وی ڕەفتارێ دورست نیشا وان ددت، ئەوێ مافێ خوە و یێ غەیری خوە پێ بپارێزن. د ڤی واریدا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) گۆتە هەڤال و هۆگرێن خوە: **((ایاكم والجلوس في الطرقات – نەکو هوون ل سەر ڕێك و ڕێباران بڕوونن))** ئینا گۆتنە پێغەمبەری: پێغەمبەرێ خودێ ئەم نەچارن و مە چو جهێن دی نینن ئەم بۆ خوە لێ باخڤن. ئینا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) گۆتە وان: **((فاذا ابیتم الا الجلوس فاعطوا الطریق حقه - ئەگەر هەوە ژ نەچاری ڕۆژدی ل سەر ڕوونشتنێ کر، پا ڤێجا مافێ ڕێکێ بدەنێ))**. ئینا گۆتن: و مافێ ڕێکێ چیە؟ گۆت: **((غض البصر، وكف الاذى، ورد السلام، والامر بالمعروف والنهي عن المنكر - چاڤگرتن، و ئێزانەدان، و سلاڤ وەرگرتن، و فەرمان ب کرنا باشییێ و دانەپاشا خرابییێ))**.

ئـ - چاڤگرتن: مەرەم ژێ ئەڤەیە:

أ- بەرێخوەنەدانا مێر و ژنانە بۆ ئێکدو، هەروەکی قورئانا پیرۆز تل بۆ درێژ کری: **((قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ – بێژە باوەرداران بلا چاڤێن خوە بگرن و چاڤگێڕییێ نەکەن)) (النور٣٠)** پاشێ دبێژت:

((وَقُل لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ – بێژە باوەردارێن ژن ژی بلا چاڤێن خوە بگرن و چاڤگێرییێ نەکەن)) (النور٣١).

و حیکمەت ژ ڤێ چەندێ ئەوە، چاڤنەگرتن و چاڤگێڕان ژ بۆ بەرێخوەدانا نەدورست و حەرام پێگاڤا ئێکێیە بۆ کرنا وێ پووچاتییێ، ئەوا مرۆڤێ خودان ڕێز و ڕوومەت خوە ژێ ددەتە پاش، پاشێ بەرێ مرۆڤی ددەتە وێ دووماهی و ئەنجاما خراب ئەوا ئەم ل ئێرە و وێراهە دبینن یان دبهیسن.

ب- خوەدانەپاش ژ زێرەڤانییا خەلکی ب ئاوایەکی گشتی.

ج- مرۆڤ ل دوو هندێ نەچت کا خەلکی چ کڕییە یان چ هلگرتییە.

د- خوەدوورئێخستن ژ دەرهێکرن و ئاشکەراکرنا کێماسی و نهێنییێن خەلکی.

ب - ئیزانەدان: و مەرەم ژێ:

ئـ- ئەوە مرۆڤ تانان د خەلکی نەقوتت و کێماسییان بۆ وان چێ نەکەت و ناڤێن خراب ل وان نەکەت و جڤین و خەبەران نەبێژتە وان.

ب- بێبەختی و بێوژدانییان ل بێگونەهان نەکەت.

پ - کەربێن خەلکی ڤەنەکەت و یارییێن خوە ب وان نەکەت.

ت- فتنەیێ د ناڤبەرا خەلکیدە هلنەئێخت و ئاخفتنێ د ناڤبەرا واندا ڤەنەگوهێزت.

پ - نەدەتە سەر مافێ خەلکی. بۆ نموونە هندەك كەس ددەنە سەر مافێ غەیری خوە، دەمێ تورمبێلێن خوە ل جهێن نەتایبەت بۆ ڕاوەستانێ، ل سەر ڕێك و ڕێبارا خەلکی یان ل بەر دەرێ مالێن خەلکی ڕادوەستینن.

ج - مرۆڤ ئاستەنگان نەئێختە د ڕێکا خەلکیدا، دا زیانێ بگەهینتە وان، ئانکو تشتێ وەکی گلێشی و قاف و قۆتان نەکەتە د ڕێکا واندا.

ح - بەرهنگاری کچێن خەلکی نەبت، و نەچتە د ڕێکا قوتابییێن کچدا و ل بەر دەرێ قوتابخانەیێن وان ڕانەوەستت.

خ - مرۆڤ ئازادییا خەلکی تێکنەدەت، نەمازە یا جیرانێن خوە و ل بەر دەرێ مالێن وان ڕانەوەستت و زێرەڤانییا وان نەکەت.

ز - ل سەر ڕێك و ڕێباران، دەنگێ خوە د ڕوویێ خەلکیدا بلند نەکەت.

گ - ترسێ ب چو ڕێکان نەکەتە د دلێ خەلکیدا و نەخوەشییێ بۆ وان چێ نەکەت.

ك- خەلکی ب مەیڤەخوارن و سەرخوەشییێ ئیزا نەدەت، وەکی هندەکان دەمێ سەرخوەش تورمبێلێ دئاژۆن یان شووشە و بتلێن خوە دئاڤێژنە سەر ڕێك و ڕێبارا خەلکی.

٣- سلاڤ وەرگرتن:

سلاڤکرن سونەتە و وەرگرتنا وێ فەرزە (فرض کفایة)یە - دەمێ هندەك ب وەرگرتنا وێ ڕادبن ل سەر یێن دی ڕادبت و نامینت — و باشترە وەرگرتن و ڤەگێڕانا سلاڤێ ئانکو بەرسڤدان چێتر و جوانتر بت.

ئەگەر ئێکێ گۆت: (السلام علیك)، باشترە بەرسڤدان هۆسا بت: (وعلیکم السلام ورحمة الله وبرکاته).

٤ - فەرمان ب کرنا باشییێ و دانەپاشا خرابییێ:

ئەگەر ڕوونشتنا هندەك کەسان ل سەر ڕێك و ڕێباران پێڤی و پێدڤی بت و نەشێن بهێلن، ئەها هنگێ هندەك گرنگی دکەڤنە سەر ملێ وان دڤێت ب جه بینن. دڤێت هاریکارییا پیرەمێر و پیرەژنان بکەن و دلۆڤانییێ ب کەسێن نەچار و لاواز و نەخوەش ببەن، و هەر خرابی و ڕەوشتەکێ نەباش ب چاڤ ببینن خوە ژێ بدەنە پاش و بەرێ غەیری خوەژی ژێ وەرگێڕن.



## ڕاهێنانا ئێكێ

١- ئایەتەكا پیرۆز بنڤیسە داخوازێ ژ باوەرداران (چ مێر چ ژن) بكەت، چاڤێن خوە ژ بەرێخوەدانا حەرام و چاڤگێڕییێ بگرن.

٢- فەرمۆدەیەكێ بنڤیسە– تە ژ بەر بت – بەحسێ وان مافان بكەت، ئەوێن دڤێت ئەو كەس ب جھ بینن، ئەوێن ل سەر ڕێك و ڕێباران ڕوودنن.

## ڕاهێنانا دوییێ

ب ئاوایەكی گونجایی، ڤان هەردو دەستەواژەیان بكە د ڤالاهیێێن خوارێدا:

(خوە دوورئێخستنە ژ زێرەڤانییا خەلكی - خیانەتا چاڤییە)

١- ئەگەر ئێكێ ب دزیڤە، بەرێ خوە دا ژنەكا بیانی، كارێ وی ئەڤە ......................

٢- چاڤگرتنێ، مەرەم ژێ ..................

## ڕاهێنانا سێیێ

١- ئەگەر مرۆڤێ موسلمان سلاڤ وەرگرت یان ڤەگێڕا دڤێت چ بێژت؟ دیار بكە.

٢- ئەگەر هندەك نەچاربوون ل سەر ڕێك و ڕێباران بڕوونن، ئەڤە فەرمان ب كرنا باشییێ كەڤتە د ستوییێ واندا – دیار بكە.

## ڕاهێنانا چارێ

بەرسڤا دورستا د ناڤبەرا دو كڤاناندا بۆ هەر ڤالاهییەكا خوارێ هلبژێرە:

١- ئیزانەدانا فەرمۆدەیا پیرۆز ژێ دبێژت، خوە دوورئێخستنە ژ (بەلاڤكرنا تەناهییێ – پشتڕاستكرنا خەلكی - بەلاڤكرنا ترسێ).

٢- ئیزانەدانا فەرمۆدەیا پیرۆز ژێ دبێژت، خوە دوورئێخستنە ژ (بێبەختیكرنێ – خوە دوورئێخستن ژ بێبەختییێ – بیركرنا بێبەختییێ).

٣- ئیزانەدانا فەرمۆدەیا پیرۆز ژێ دبێژت، خوە دوورئێخستنە ژ (قەدرگرتنا پیرەمێر و دانعەمران – كەربڤەكرنا خەلكی – چارەسەركرنا ڕەوشێن ب لەز).

٤- ئیزانەدانا فەرمۆدەیا پیرۆز ژێ دبێژت، خوە دوورئێخستنە ژ (بەرهنگاربوونا كچان – كارئینانا تەلەڤۆنێ بۆ ڕەوشێن مرۆڤاتییێ – هاریكاریكرنا زەلامێ كۆرە ژ بۆ دەربازبوونێ).

### بزاڤەك:

- ئەو فەرمۆدەیا پیرۆز، ئەوا ل سەر ڕێز و ڕەوشتێن ڕوونشتنا ل سەر ڕێك و ڕێباران، ژ بەرێ قوتابییانڤە بێتە ژ بەركرن.

## وانەیا هەڤدەیێ

# ستوون و سونەتێن نڤێژێ



نڤێژ د دینێ مەیێ ئیسلامییێ ڕاست و دورستدا، ژ گرنگترین ستوونێن پەرستنانە؛ چونکی جهئینانا فێ پەرستنێ، مرۆڤێ موسلمان ژ یێ نەموسلمان جودا دکەت. پەرستنا نافئینایی، گەلەك سونەت و ستوون هەنە، دڤێت مە ئاگەه ژێ هەبت و ئەم بزانن، دا ب جهئینان و کرنا وان، نڤێژێن مە، ل دەڤ خودێ بێنە پەسەندکرن. ژ گرنگترین سونەت و ستوون و سیمایێن نڤێژێ ئەڤەنە:

أ – ستوونێن نڤێژێ :

١- ئنیەت.

٢- تەکبیرا دەستپێکرنێ.

٣- ڕابوون و ژ پێرڤە ڕاوەستان بۆ کەسێ بشێت.

٤- خواندنا سۆرەتا (فاتیحەیێ – الفاتحة).

٥- داچەمیانا دورست و مرۆڤ ژێ پشتڕاست.

٦- ڕاستڕابوونا مرۆڤ ژێ پشتڕاست.

٧- سوجدەیا مرۆڤ ژێ پشتڕاست.

٨- ڕوونشتنا د ناڤبەرا هەردو سوجدەیاندا یا مرۆڤ ژێ پشتڕاست.

٩- ڕوونشتنا دووماهییێ، کو شادەدان و سلاڤدان ل سەر پێغەمبەری تێدابت.

١٠- سلاڤا ملێ ڕاستێ.

ب - سونەتێن نڤێژێ:

### أ - بەری دەستپێکرن و خوەپێکرنێ:

١ - بانگ.    ٢ - قامەت.

**ب - پشتی دەستپێکرن و خوەپێکرنێ:**

١ - شادەدانا ئێکێ.

٢ - خواندنا قنووتێ د نڤێژا سپێدەیێ و وترێن نیڤەکا دویێ ژ ڕەمەزانێدا.

**ج - سیمایێن نڤێژێ:**

١- بلندکرنا هەردو دەستان د دەمێ تەکبیرا دەستپێکرنێدا.

٢- بلندکرنا هەردو دەستان د دەمێ داچەمیان و ڕابوونا پشتی وێدا.

٣- دانانا دەستێ ڕاستێ ل سەر یێ چەپێ.

٤- دوعایا دەستپێکرنێ.

٥- خوە ب خودێ پارزتن ژ شەیتانی بەری خواندنێ.

٦- دەنگدەرئێخستن د نڤێژا سپێدەیێ و هەردو ڕەکعەتێن پێشییێ ژ نڤێژا مەغرەب و یا عەیشا.

٧- گۆتنا (ئامین) پشتی خواندنا فاتیحەیێ.

٨- خواندنا سۆرەتەکێ پشتی سۆرەتا فاتیحەیێ بۆ ئیمامی و کەسێ ب تنێ نڤێژێ دکەت.

٩- تەکبیردان د دەمێ داچەمیان و ڕابوونێدا.

١٠- گۆتنا: (سمع الله لمن حمده، ربنا ولك الحمد) دەمێ ڕابوونا پشتی داچەمیانی.

١١- گۆتنا (سبحان ربي العظيم) دەمێ داچەمیانێ، و (سبحان ربي الاعلى) دەمێ سوجدەبرنێ.

١٢- دانانا دەستان ل سەر ڕانان د هەردو ڕوونشتنێن شادەدانێدا (یا ئێکێ و یا دویێ)، کو دەستێ چەپێ، ڕاست و ڤەکری دانتە سەر ڕانێ چەپێ، و یێ ڕاستێ، گرتی ژ بلی تلا شادەدانێ، دانتە سەر ڕانێ ڕاستێ.

١٣- ڕوونشتن ل سەر هەردو پێیان، د هەمی ڕوونشتناندا، و د بن هلکرنا سەرێ پێ چەپێ د بن یێ ڕاستێڤە، د ڕوونشتنا دووماهییێدا، کو ب عەرەبی دبێژنێ (تورك).

١٤- سلاڤا ملێ چەپێ.

**د – تشتێ نڤێژ پێ بەتال دبت:**

١- ئاخڤتنا ژ خوە و ژ قەست.

٢- گەلەك خوەلڤاندن.

٣- هەر با و دەنگەکێ ژ پاشییا مرۆڤی دەرکەڤت.

٤- پیسبوون.

٥- دیاربوونا جهێ شەرمگەهێ.

٦- گوهۆڕینا ئنیەتێ.

٧- پشتدانا قیبلەیێ.

٨- خوارن.

٩- ڤەخوارن.

١٠- تیقەلیق.

١١- وەرگەڕیان ژ موسلمانەتییێ.

هـ - سونەتێن د گەل نڤێژێن فەرز: سونەتێن د گەل نڤێژێن فەرز هەڤدە ڕەکعەتن:

١- دو ڕەکعەت بەری نڤێژا سپێدەیێ.

٢- چار ڕەکعەت بەری نڤێژا نیڤرۆ و دو پشتی وێ.

٣- چار ڕەکعەت بەری نڤێژا ئێڤاری.

٤- دو ڕەکعەت پشتی نڤێژا مەغرەب.

٥- سێ ڕەکعەت پشتی نڤێژا عەیشا کو یا دووماهییێ کەت بت.

و - زێدەنڤێژێن موکوم: سێنە:

١ - شەڤنڤێژ. ٢ - نڤێژا تێشتەگەهێ. ٣ - نڤێژا تەراویحان.

تشتێ پێشتر هاتییە گۆتن ژ ستوون و سیماییێن نڤێژێ، بۆ زەلام و ژنانە بێ جودایی، ژ بلی هندەك تشتێن بچووك، کو جهێئینانا ژنان تێدا، ژ یا زەلامان جودایە، و نەخشەیێ خوارێ بۆ دیارکرنا وان جوداییان هاتییە تەرخانکرن:

| زەلام | ژن |
|---|---|
| ١ - د داچەمیان و سوجدەبرنێدا ئەنیشکێن خوە ژ تەنشتان دەردئێخت. | ١ - د داچەمیان و سوجدەبرنێدا خوە ئێکتا دکەت و خوە دکەتە تێکڕا. |
| ٢ - د دەمێ دەنگ دەرئێخستنێدا، دەنگێ خوە دەردئێخت و بلند دکەت. | ٢ - د دەمێ دەنگدەرئێخستنێ ژیدا، ئەگەر هندەك زەلامێن بیانی ل دەر و دۆرێن وێ بن، دەنگێ خوە دەرنائێخت و بلند ناکەت. |
| ٣ - ئەگەر خەلەتی یان تشتەکی ب ترس پەیدابوو، دێ بێژت (سبحان الله) | ٣ - ئەگەر خەلەتی یان تشتەکی ب ترس پەیدابوو، دێ پشتا دەستێن خوە لێکدەت. |
| ٤ - شەرمگەها وی د ناڤبەرا نافکێ و چۆکێدایە. | ٤ - شەرمگەها وێ، هەمی لەشێ وێیە، ژ بلی ناڤچاڤ و هەردو لەپان. |

## دان و ستاندن:

- تشتێ نڤێژ پێ بەتال دبت چیە، و ئەگەرێ بەتالبوونا نڤێژێ پێ چیە؟
- د چ تشتیدا، ژن و زەلام د نڤێژکرنێدا، وەکی ئێك نینن؟
- جودایی د ناڤبەرا سونەت و ستوونێن نڤێژێدا چیە؟
- هەژمارا ڕەکعەتێن سونەتێن دورست و موکوم چەندن، و چاوا ل سەر نڤێژێن فەرز دئێنە پشککرن؟



# نڤێژا ب جەماعەت

## باشی و خێرا نڤێژا ب جەماعەت:

دینێ مە یێ ئیسلامێ دینەکی جڤاکییە، هەردەم داخوازا کۆمبوون و ئێکگرتنێ دکەت و حەز ژ ژێکرەڤین و ژێکچوونەپاشێ ناکەت. ئیسلامێ موسلمان د بەر هندێرا کرینە، گیانێ کارێ ب کۆم د پەرستن و بازارکرن و هەمی کارێن دیدا بەلاڤ بکەن، و خودایێ مەزن بەرەکەت و زێدەیییێ دئێختە د هەر کارەکێدا کو ب کۆم بێتە ئەنجامدان، نەمازە نڤێژا ب جەماعەت. باشییا ڤێ نڤێژێ و خەلاتێ وێ گەلەك مەزنە. پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) دبێژت: **((صلاة الجماعة افضل من صلاة الفرد بسبع وعشرين درجة))**. ئانکو: نڤێژا ب جەماعەت بیست و حەفت پێك و پەیسکان ژ وێ نڤێژێ چێترە، ئەوا ب تنێ دئێتە کرن.

## هەژمارا جەماعەتا نڤێژێ:

ژ بەر گرنگییا نڤێژا ب جەماعەت، دورستە ب دو کەسان ژی بێتە کرن: (ئیمام و ئێکی دی)، هندی هەژمارا نڤێژکەران گەلەك بت، باشتر و ب خێرترە ل دەڤ خودێ. پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) دبێژت: **((صلاة الرجل مع الرجل ازكى من صلاته وحده وصلاته مع الرجلين ازكى من صلاته مع الرجل وما كان أكثر، فهو أحب الى الله تعالى))** (ئەحمەد و ئەبوو داود و نەسائی ڤەگوهازتییە). ئانکو: نڤێژا مرۆڤی د گەل غەیری وی، ب خێرترە ژ نڤێژا وی ب تنێ، و نڤێژا وی د گەل دویان، ب خێرترە ژ نڤێژا وی د گەل ئێکێ ب تنێ، و هندی ئەوێن د گەل پتربن، نڤێژا وی چێتر و ب خێرترە ل دەڤ خودێ)).

## جهێ جهئینانا نڤێژا ب جەماعەت:

١. کرنا نڤێژا ب جەماعەت ل مزگەفتێ، چێترە ژ کرنا وێ ل هەر جهەکی دی.

٢. ئەگەر رێ نەکەفتێ نڤێژ ل مزگەفتێ بێتە کرن، دورستە ل هەر جهەکی دی یێ تایبەت (چ ل قوتابخانەیێ بت، چ ژی ل فەرمانگەهێ یان ل سەر رێکێ بت)، بێتە کرن.

٣. خێرا مزگەفتا دوور، پترە ژ یا مزگەفتا نێزیك.

٤. ژن دشێن نڤێژا ب جەماعەت ل مال بکەن.

## دان و ستاندن:

١. باشی و خێرا نڤێژا ب جەماعەت دیار بکە.

٢. وان بەلگەیان بێژە، ئەوێن ل سەر باشی و خێرا نڤێژا ب جەماعەت هاتین.

٣. ئەرێ دورستە نڤێژا ب جەماعەت ب دو کەسان بێتە کرن.

٤. ڤان ڤالاهییان ب پەیف و دەستەواژەیێن گونجایی تەژی بکە:

١- خێرا نڤێژا ........................ پترە ژ یا نڤێژا ئێکێ ب تنێ.

٢- کرنا نڤێژا ب جەماعەت ل ........................ ب خێرتر و چێترە ژ کرنا وێ ل جهەکی دی.

٣- ژن دشێن نڤێژا ب جەماعەت ل .................... بکەن.

٤- هندی هەژمارا نڤێژکەران پتربت ........................ و ل دەڤ خودێ ب خێرترە ژی.



## وانەیا نۆزدەیێ

# نڤێژا ئەینییێ

### خێرا ڕۆژا ئەینییێ:

ڕۆژا ئەینییێ، ڕۆژا بێنڤەدانا موسلمانانە، و ژ باشترین و چێترین ڕۆژێن حەفتییێیە، موسلمان تێدا خودێ دئینننە بیرا خوە و سوپاسییا وی دکەن، و ل مالێن خودێ کۆم دبن، دا گوهدارییا گۆتارا ئەینییێ بکەن و پێکڤە نڤێژا ڕۆژا ئەینییێ بکەن.

### حوکمێ نڤێژا ئەینییێ:

نڤێژا ئەینییێ فەرزە ل سەر هەر موسلمانەکێ، چونکی خودایێ مەزن دبێژت: **((يا أيها الذين آمنوا اذا نودي للصلاة من يوم الجمعة فأسعوا الى ذكر الله وذروا البيع ذلكم خير لكم ان كنتم تعلمون))** سۆرەتا **(الجمعة - ئایەتا هەژمار ٩)**. ئانکو: گەلی کەسێن هەوە باوەری ئینایی، ئەگەر بانگێ نڤێژا ئەینییێ هاتە دان، ب لەز ڤەستا بیرئینانا خودێ بکەن، و دەست ژ کڕین و فرۆتنێ بەردەن، ئەڤە بۆ هەوە ب خێرترە ئەگەر هوون بزانن.

### مەرجێن جهئینانا وێ:

١- نێراتی، چونکی کرنا وێ ل سەر مێیان نەهاتییە فەرکرن.

٢- بالقبوون و گەهشتن، چونکی کرنا وێ ل سەر زاڕۆکی نەهاتییە فەرکرن.

٣- ساخلەمی، کرنا وێ ل سەر کەسێ نەساخ و ئەوێ نەشێت بەرهەڤ ببت نەهاتییە فەرکرن.

٤- خوەجهی، کرنا وێ ل سەر ڕێباران نەهاتییە فەرکرن. و هەچی گاڤا ئەگەر پەیدا بوون، بلا ئەو نڤێژێ بکەت.

### مەرجێن نڤێژێ:

١- باژێر یان گوند: نابت نڤێژا ئەینییێ ل جهێن مرۆڤ لێ نەخوەجه یان د دەمێ ڕێبارییێ (سەفەرێ)دا، بێتە کرن.

٢- مزگەفت: نابت ل جهێ نە مزگەفت بێتە کرن.

٣- گۆتار: نڤێژ بێ گۆتار دورست نینە، چونکی د بنیاتدا ژ بەر وێ گۆتارێ هاتییە فەرکرن.

٤- کۆم: نابت بێ کۆم و نە د دەمێ خوە یێ ڤەبڕی و دەستنیشانکریدا بێتە کرن.

## وانەیا بیستێ

# مفایێن نڤێژا ئەینییێ



١. گوهداریكرن و وەرگرتنا مفایی ژ گۆتارا نڤێژا ئەینییێ.

٢. ئاگەهداری ژ ڕوودان و گوهۆڕینان د مەیدانا ئیسلامیدا و ژ هەمی ڕەخ و ئالییێن جڤاكی و زانستی و سیاسیڤە.

٣. موسلمان هەڤدو دبینن و سلاڤی ئێك دكەن و ئاگەهداری ڕەوشا ئێكدو دبن.

## كاروبارێ نڤێژا ئەینییێ:

١. شووشتن و ڤەشووشتن و بێنخوەشی.

٢. نڤێژكەر جلكێن پاقژ و بژوون بكەتە بەر خوە.

٣. زووچوونا مزگەفتێ.

٤. هێلانا كڕین و فرۆتنێ و هەر بازاڕەكا دی، دەمێ بانگدانێ.

٥. خوەدوورئێخستن ژ خوارنا سیر و پیڤازێ.

٦. خوەدانەپاش ژ گەلەك ئاخفتنێ د دەمێ گۆتارخواندنێدا.

٧. دوعاكرن و دانا سلاڤان ب زێدەیی ل سەر پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن).

## دەمێ نڤێژا ئەینییێ، نڤێژکەر د مزگەفتێدا چ بکەت؟

١. دو ڕەکعەت سونەت وەك (سلاڤدانا مزگەفتێ) بکەت، دەمێ ب ژۆرا مزگەفتێ دکەڤت.

٢. هندی بشێت بۆ خوە زێدەنڤێژان بکەت.

٣. جوانڕوونشتن و گوهداریکرنا گۆتارخوونی ب بێ دەنگی.

٤. پشتی ب دووماهیهاتنا گۆتارێ، گۆتارخوون دێ ژ مینبەرێ ئێتە خوارێ، پاشێ دێ قامەتا نڤێژێ ئێتە گرتن، و ئیمام دێ دەست ب کرنا دو ڕ ەکعەتێن نڤێژێ کەت کو خواندن تێدا ب دەنگێ بلند بت.

## ژ پێنەگیرییێن نڤێژکەران د نڤێژا ئەینییێدا:

١. نڤێژکەر دەرەنگ بچتە مزگەفتێ.

٢. نڤێژکەران بئێشینت و خوە د سەر ملێ وانڕا باڤێژت، دا بچتە پێشتر.

٣. د دەمێ خواندنا گۆتاریدا، پشتا خوە بدەتە گۆتارخوونی و قیبلەیێ.

٤. نڤستن د بەر خواندنا گۆتاریڕا.

٥. ئاخڤتن د دەمێ خواندنا گۆتاریدا.

٦. گوهنەدانا گۆتارخوونی و خوەمژوولکرن ب تزبییان یان ب هەر تشتەکی دیڤە.

ئەڤە هەمی ژ وان کارانە، یێن دڤێت نڤێژکەر خوە ژێ دوور بێخت، دا نڤێژا خوە دورست بکەت.



## دان و ستاندن:

١- دەمێ نڤێژا ئەینییێ کەنگێیە؟

٢- چ بەلگە هەیە ل سەر فەرزکرنا نڤێژا ئەینییێ؟

٣- مەرجێن فەرزکرنا نڤێژا ئەینییێ چنە؟

٤- مەرجێن دورستییا نڤێژا ئەینییێ چنە؟

٥- مفایێن نڤێژا ئەینییێ بێژە.

٦- ڕێزین جهێینانا نڤێژا ئەینییێ بێژە.

٧- نڤێژا ئەینییێ چەند ڕەکعەتن؟ و خواندنا ئیمامی تێدا ب دەنگێ بلندە یان ب یێ نزمە؟

٨- هندەك ژ پێنەگیرییێن خەلكی د نڤێژا ئەینییێدا دیار بكە.



## وانەیا بیست و ئێکێ

# نڤێژا هەردو جەژنان



### خێر و باشییا هەردو جەژنان:

خودایێ مەزن دو جەژنێن مەزن داینە موسلمانان، کەیفا وان ب هاتنا وان دئێت و پێ کەیفخوەش دبن، ئەوژی ئەڤەنە:

١- جەژنا ڕەمەزانێ: پشتی ب دووماهیهاتنا ڕۆژیگرتنا هەیڤا ڕەمەزانا پیرۆز دئێت، کو دکەڤتە ئێکی هەیڤا شەوالێ.

٢- جەژنا حاجییان یان یا قوربانی: موسلمان د ڤێ جەژنێدا، پشکدارییێ د وێ کەیفێدا دکەن، ئەوا حەجی ژ بەر جهئینانا فەرزا حەجێ پێ کەیفخوەش دبن، کو دکەڤتە ڕۆژا دەهێ ژ هەیڤا (ذي الحجة).

### ژ رامانێن جەژنێ:

١- موسلمان کەیفخوەش دبن ب تەمامبوونا ڕۆژییێن هەیڤا ڕەمەزانێ، هەروەسا کەیفخوەشییا خوە دیار دکەن، ب جهئینانا رێ و ڕەسمێن فەرزا حەجێ ژ بەرێ حەجییانڤە.

٢- موسلمان د مزگەفتاندا کۆم دبن ژ بۆ بەرجەستەکرن و ساخکرنا رێ و ڕەسمێن ئیسلامێ.

٣- موسلمان پیرۆزباهییێ ل ئێکدو دکەن و سەرا ئێکدو ددەن، و ئەڤە دبتە ئەگەرێ خوەشکرن و موکومکرنا هەڤبەندییێن براتییێ د ناڤبەرا واندا.

٤- ب دانا فترەیێن ڕەمەزانێ و گۆشتێ قوربانان د جەژنا حاجییاندا، دەستێ هاریکارییێ بۆ ژار و دەستتەنگان دئێتە درێژکرن.

## کاروبارێ نڤێژا جەژنێ:

١- خوەشووشتن و بێنخوەشی و ل بەرکرنا جلکێن پاقژ و بژوون.

٢- ڕۆژی شکاندن- خوارنا هندەك قەسپان یان فەخوارنا پچەکا ئاڤێ بەری مرۆڤ بچتە نڤێژا جەژنا ڕەمەزانێ.

٣- مرۆڤ زوو قەستا نڤێژێ بکەت.

٤- تەکبیردان و و گەلەك بیرئینانا خودێ ئانکو گەلەك زکرکرن.

٥- پیرۆزباهیکرنا هەر کەسەکێ ب گۆتنا (خودێ ژ مە و هەوە قەبوول بکەت).

٦- ژ سونەتێیە، مرۆڤ د ڕێکەکێڕا بچتە مزگەفتێ و د ئێکا دیڕا بزڤڕتەڤە.

## چاوایییا کرنا نڤێژێ:

١ – پشتی هلاتنا ڕۆژێ ب چەندەکێ، مرۆڤ ژ بۆ کرنا نڤێژا جەژنێ، قەستا مزگەفتێ بکەت.

٢- نڤێژا جەژنێ، نە بانگ هەیە نەژی قامەت، و خواندنا ئیمامی تێدا ب دەنگێ بلندە.

٣- نڤێژا جەژنێ دو ڕەکعەتن و ب ڤی ئاوایی دئێنە کرن:

أ- پشتی تەکبیرا دەستپێکرنێ و بەری خواندنا سۆرەتا فاتیحەیێ، ئیمام و یێن ل پشت، د ڕەکعەتا ئێکێدا، حەفت تەکبیران و د یا دوییێدا پێنج تەکبیران ددەن.

ب- پشتی ژ نڤێژێ ب دووماهی دئێن، گۆتارخوون دێ ب سەر مینبەرێ کەڤت و گۆتارا جەژنێ خوونت.

٤- پشتی گۆتار ب دووماهی دئێت، و گۆتارخوون ژ مینبەرێ دئێتە خوارێ، نڤێژکەر دێ جەژنا هەڤدو پیرۆز کەن.

## دان و ستاندن

١- بۆ چ خودایێ مەزن جەژنا ڕەمەزانێ داییە موسلمانان؟

٢- د کیژ جەژنێدا قوربان دئێنە دان؟

٣- گرنگترین کاروبارێن نڤێژا جەژنێ بێژە؟

٤- هەژمارا ڕەکعەتێن نڤێژا جەژنێ چەندن؟ و ب چ ژ نڤێژا ئەینییێ جودایە؟

٥- بلندترین ڕامانێن جەژنێ چنە؟ دیار بکە.

٦- نیشانا (✓) بەرانبەری دەستەواژەیا دورست و یا (✗) بەرانبەری یا نەدورست دانە:

أ- دورستە مرۆڤێ موسلمان نڤێژا هەردو جەژنان ل مال بکەت.

ب- نڤێژا جەژنێ بێ بانگە.

جـ- بەری نڤێژا جەژنێ، خوارن دورست نینە.

د- ئیمام دەستپێکێ گۆتارێ دخوینت، پاشێ نڤێژا جەژنێ ل پێشییا نڤێژکەران دکەت.



## وانەیا بیست و دوییێ

# نڤێژا مرۆڤێ ڕێبار (کورتکرن و کۆمکرنا نڤێژێ)

خودایێ مەزن ژ بۆ بارسڤککرنا موسلمانان، ڕێکا کورتکرن و کۆمکرنا نڤێژێ د وەغەرێدا ل بەر مرۆڤێ موسلمان ڤەکرییە، دا وەغەرا وی نەبتە ئەگەرێ نەکرن و هێلانا نڤێژێ، چونکی دینێ ئیسلامێ، دینێ ب سانەهیئێخستن و بارسڤککرنێیە. ژ بەر ڤێ ئێکێ، دورستە کەسێ ڕێبار نڤێژا خوە کورت بکەت یان دو نڤێژان د گەل ئێك کۆم بکەت و ب ڤی ئاوایی:

١- **کورتکرن**: کورتکرنا نڤێژا چارڕەکعەتە (یا نیڤرۆ و یا ئێڤاری و یا عەیشا)، ئانکو کورتکرن د یا سپێدەیێ و مەغرەبدا نینە. بەلگە ل سەر کورتکرنێ ئەوە خودێ دبێژت: **((وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلاَةِ )) (النساء ١٠١)** ئانکو: ئەگەر هوون ب وەغەرەکێ چوون، دورستە هوون نڤێژا خوە کورت بکەن. هەروەسا پێغەمبەر ژی (سلاڤ لێ بن) دبێژت: **((صدقة تصدق الله بها عليكم فاقبلوا صَدَقته)) (ل سەر ئێك دەنگن)**. ئانکو: خێرەکە خودێ د گەل هەوە کرییە، خێرا وی وەرگرن و قەبوول بکەن.

**حوکمێ وێ**:

نڤێژا ڕێباری سونەتەکا موکومە، چونکی دەستووردان و دیارییەکە ژ نك خودێ، دڤێت پێگیری پێ بێتە کرن و ژێ بێتە وەرگرتن.

دووراتییا وەغەرێ:

دووراتییا وەغەرێ ژ بەرێ هندەك زانایانڤە ب (٨٤) کیلۆمێتران هاتییە دەستنیشانکرن. دبێژن دڤێت کێمتر نەبت. و جودایی ژی نەئێخستینە ناڤبەرا وەغەرا تورمبێلێ یان یا فڕۆکەیێ یان یا شەمەندەفرێ و یان ئەوا ب پێیان دئێتە کرن...

**تێبینی**: ئەگەر ڕێباری نڤێژا چارڕەکعەت ب جەماعەت ل پشت ئیمامێ خوەجە کر، دڤێت وەکی ئیمامی و جەماعەتا نڤێژکەران، چار ڕەکعەتان بکەت.

٢- **کۆمکرن**: د وان نڤێژاندایە ئەوێن ل دوو ئێك و دەمێ وان ب سەرێکڤە، وەکی نڤێژا نیڤرۆ و یا ئێڤاری و نڤێژا مەغرەب و یا عەیشا و ب ڤی ئاوایی:

أ- ڕێبار دێ دەمێ نڤێژا نیڤرۆ، نڤێژا ئێڤاری پێشئێخت و پشتی یا نیڤرۆ کەت، و دبێژنە ڤێ (کۆمکرنا پێشئێخستی) یان دێ یا نیڤرۆ پاشئێخت و دەمێ یا ئێڤاری و بەری وێ کەت، و دبێژنە ڤێ (کۆمکرنا پاشئێخستی).

ب- ڕێبـار دێ نڤێـژا مـەغرەب و عەیشـا ژی د دەمـێ ئێـك ژ هـەردو نڤێژانـدا كـەت، ڤێجـا چ یـا عەیشـا پێشبێخت و پشتی یا مەغرەب بكەت، چ ژی یا مەغرەب پاشبێخت و بەری یا عەیشا بكەت.

ج- نڤێژا سپێدەیێ د گـەل چو نڤێـژان نائێتـە كۆمكرن، هەروەسا نڤێـژا مـەغرەب د گـەل چـو نڤێـژان نائێتە كورتكرن.

پێكڤە كورتكرن و كۆمكرنا نڤێژا نیڤرۆ و یا ئێڤاری:

ڕێبار دێ ئنیەتا كرنا نڤێژا نیڤرۆ و یا ئێڤاری پێكڤە كورتكری یان كۆمكری ئینت و بێژت: مـن ئنیەتـە دو ڕەكعەت نڤێژا نیڤرۆ د گەل یا ئێڤاری كورتكری و كۆمكری بكەم. و كرنا وان ب ڤی ئاوایییە:

١- دێ دو ڕەكعەت نڤێژا نیڤرۆ كەت و سلاڤ دەت.

٢- دێ دو ڕەكعەت نڤێژا ئێڤاری كەت و سلاڤ دەت.

٣- چو نڤێژێن سونەت و غەیری سونەت نائێختە نافبەرا نڤێژا نیڤرۆ و یا ئێڤاری.

## دان و ستاندن:

١- چ پەندیاری و حیكمەت د فەرماندانا نڤێژا ڕێباریدا هەیە؟

٢- ڕامان ژ كورتكرنا نڤێژێ چیە؟ و چ بەلگە ل سەر هەیە؟

٣- مەرەم ژ كۆمكرنێ چیە د نڤێژا ڕێباریدا؟

٤- ڕێبار دێ چاوا كورتكرن و كۆمكرنێ ب جه ئینت، ئەگەر ڤیا نڤێژا ئێڤاری پێشبێخت؟

٥- ڤان ڤالاهییان ب پەیڤ و دەستەواژەیێن گونجایی تەژی بكە:

نڤێژا ڕێباری ......... موكومە، و كورتكرن د نڤێـژا ................ و نڤێـژا ............ دا نینـە، دووراتییا وەغەرێ ژ بەرێ هندەك زانایانڤـە ب ........................ هاتییـە دەستنیشـانكرن، و نڤێـژا مـەغرەب د گەل ........................ نائێتە كورتكرن.

٦- ئەگەرێ ڤان چیە؟:

١- ئەگـەر ڕێبـاری نڤێـژا چارڕەكعەت ب جەماعـەت ل پشـت ئیمـامێ خوەجـه كـر، دێ وەكـی ئیمـامی و جەماعەتا نڤێژكەران، چار ڕەكعەتان كەت.

٢- نڤێژا سپێدەیێ د گەل چو نڤێژان نائێتە كۆمكرن.

## وانەیا بیست و سێیێ

# نڤێژا بارانێ



### گرنگییا نڤێژا بارانێ:

ئاڤ پێدڤییە بۆ بەردەوامییا ژین و ژیارێ، مرۆڤ و گیانەوەر و شینکاتی پێکڤە مفایی ژێ وەردگرن. خودێ دبێژت: ((وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ )) (الانبیاء۳۰). ئەگەر بۆ دەمەکی درێژ باران ژ جهەکێ هاتنە بڕین و ئەرد و شینکاتی هەڤتووشی هشکاتییێ بوون، موسلمان نڤێژا بارانێ - کو سونەتەکا موکومە - دکەن و تێدا داخوازێ ژ خودێ دکەن، دلۆڤانی و هاریکارییا خوە ب سەر واندا داڕێژت و وان ژ بارانان بێبار نەکەت.

### چاوایییا کرنا نڤێژێ:

باشترە بەری کرنا ڤێ نڤێژێ ب چەند ڕۆژەکان خەلك ژ بەرێ ئیمامیڤە بێتە ئاگەهدارکرن، و داخواز ژ وان بێتە کرن ل خوە بزڤڕن و دەست ژ گونەهێن خوە بەردەن و پێگیرییێ ب فەرمانێن خودێ بکەن و خوە بۆ نڤێژا بارانێ بەرهەڤ بکەن. نڤێژا ژێگۆتی ب جەماعەت و بێ بانگ و بێ قامەت دئێتە کرن، تنێ ب گۆتنا (الصلاة جامعة) خەلك بۆ دئێتە گازیکرن، و باشترە ژ دەرڤەیی گوندی یان باژێری بێتە کرن. نڤێژا بارانێ وەکی نڤێژا هەردو جەژنان دو ڕەکعەتن و خواندن تێدا ب دەنگێ بلندە و ب ڤی ئاوایی دئێتە کرن:

١- ئیمام د ڕەکعەتا ئێکێدا بەری خواندنا سۆرەتا (فاتیحە)یێ حەفت تەکبیران دێ دەت، و پشتی خواندنا (فاتیحە)یێ، سۆرەتا (سبح اسم ربك الاعلى) دێ خوونت.

٢- ئیمام د ڕەکعەتا دوییێدا و بەری خواندنا سۆرەتا (فاتیحە)یێ پێنج تەکبیران دێ دەت، و پشتی خواندنا (فاتیحە)یێ، سۆرەتا (هل أتاك حديث الغاشية) دێ خوونت.

٣- پشتی ب دووماهیهاتنا نڤێژێ ئیمام دێ ڕابت گۆتارەکێ خوونت و دێ تێدا گەلەك دوعایان کەت و داخوازا بارانێ ژ خودێ کەت و جارەکا دی دوعایان دێ کەت و نڤێژکەر دێ پشتی هەر دوعایەکێ بێژن (ئامین).

٤- ئیمام دێ خوە بەرقیبلە کەت، و نڤێژکەر ژی دێ چاڤ لێ کەن و پێکڤە (ئەو و نڤێژکەر) کراسێن خوە فاژی دێ کەنە بەرخوە. ب ڤێ چەندێ نڤێژا بارانێ ژ یا هەردو جەژنان جودایە. پاشێ پێکڤە (ئیمام و نڤێژکەر) دێ چەند دوعایەکان بۆ خوە ژ خودێ کەن و فەرڤن.

## ئێك ژ وان دوعایێن پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) بۆ داخوازا بارانێ کری:

**((اللهم اسقنا الغيث ولاتجعلنا من القانطين، اللهم أنبت لنا الزرع، وانزل علينا بركات السماء، وانبت لنا من بركات الأرض، اللهم أكشف عنا البلاء، اللهم إنا نستغفرك، انك كنت بنا غفاراً، فارسل السماء علينا مدراراً، اللهم إسقِ عبادك، وبهائمك، وأنشر رَحمتك، واحي بلدك الميت)).** ئانکو: خودێوۆ بارانێ ب سەر مەدا دارێژە و مە نەکە ژ وان کەسان ئەوێن ژ دلۆڤانییا تە بێ هیڤی. خودێوۆ شینکاتی و زەڤییێن مە شین بکە، و بەرەکەتا ئەسمانی ب سەر مەدا ببارینە، و ژ بەرەکەتا ئەردی شینکاتییێ بدە مە. خودێوۆ بەلایێ ژ مە ڤەگێڕە. خودێوۆ ئەم داخوازا گونەهـژێبرنێ ژ تە دکەین، گونەهـژێبرێ مە هەر تویی. بەرەکەتا ئەسمانی ب سەر مەدا دارێژە، خودێوۆ بەندە و گیانەوەرێن خوە تێرئاڤ بکە و دلۆڤانییا خوە ب سەر واندا بەلاڤ بکە و ڕوحێ ب ڤی باژێرێ خوە یێ مریدا بینە و زێندی بکە.



## دان و ستاندن

١- ڕامانا داخوازا بارانێ چیه؟

٢- حوکمێ نڤێژا بارانێ چیه؟

٣- ب چ نڤێژا بارانێ، ژ نڤێژا هەردو جەژنان جودایه؟

٤- نڤێژا بارانێ چەند ڕکعەتن؟

٥- ڤان ڤالاهییان تەژی بکه:

نڤێژا بارانێ ب جەماعەت و بێ ............. و بێ ............ دئێتە کرن، تنێ ب گۆتنا .................. خەلك بۆ دئێتە گازیکرن، و باشترە ژ دەرڤەیی .................... بێتە کرن، و باشترە بەری کرنا ڤێ نڤێژێ ............................ خەلك ژ بەرێ ئیمامیڤە ........................

٦-دوعایا نڤێژا بارانێ ژ بەر بکە و بنڤیسە.



## نڤێژا ڕۆژغەیرین و هەیڤغەیرینێ



ڕۆژ و هەیف ژ نیشانێن مەزناتییا خودایێ پەروەردگارن. دەمێ ئەرد دکەڤتە نافبەرا ڕۆژێ و هەیڤێ، هەیف دغەیرت و تاری ڕوویێ وێ هلدچنت و دەمێ هەیف دکەڤتە نافبەرا ڕۆژێ و ئەردی، ڕۆژ دغەیرت.

دینێ مە چو ئالییێن ژین و ژیاری نەداییینە پشت خوە، هەتا پووتە ب غەیرینا ڕۆژێ و هەیڤێ ژی کرییە. د دینێ مەدا سونەتە، دەمێ ڕۆژ یان هەیف دغەیرت، نڤێژا ڕۆژغەیرین و هەیڤغەیرینێ بێتە کرن.

### چاوایییا کرنا نڤێژێ:

دەمێ ڕۆژ یان هەیف دغەیرت، دو ڕەکعەت نڤێژ دئێنە کرن، هەر ڕەکعەتەکێ دو ڕابوون تێدانە، خواندن د ڤان ڕابووناندا دئێتە درێژکرن. هەروەسا هەر ڕەکعەتەکێ دو داچەمیان ژی تێدانە، تەسبیح د ڤان داچەمیاناندا دئێتە درێژکرن.

نڤێژا ژێگۆتی، سونەتە، چونکی پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((انَّ الشّمسَ والقمر آيتان من آيات الله لا ينكسفان لموت أحد ولا لحياته، فاذا رأيتم ذلك فصَلُّوا وادعوا الله تعالى)) (بوخاری و موسلم ڤەگێڕاییيە). ئانکو: هندی ڕۆژ و هەیڤن، دو نیشانن ژ نیشانێن خودێ، بۆ مرنا کەسێ و بۆ ژینا کەسێ نائێنە غەیرین، ئەگەر هەوە دیت غەیرین، نڤێژێ بکەن و دوعایێ ژ خودێ بکەن.

باشترە ئەڤ نڤێژە ب جەماعەت بێتە کرن و گازی ب ڤی ئاوایی (الصلاة جامعة) بۆ بێتە هلدێران، و سونەتە ژی پشتی نڤێژێ، دو گۆتارێن وەکی یێن نڤێژا ئەینییێ، بۆ بێنە خواندن.

**دان و ستاندن:**

- ئەگەرێ کرنا نڤێژا ڕۆژگەیرینێ چیە؟

- ئەرێ پشتی نڤێژا ڕۆژگەیرینێ گۆتارەك هەیە؟



## وانەیا بیست و پێنجێ

# نڤێژا مری

### گرنگییا نڤێژێ:

د ئیسلامێدا ڕێزەکا مەزن ل مرۆڤی دئێتە گرتن، چ ساخ بت چ ژی مری. دەمێ مرۆڤێ موسلمان دمرت، ئیسلام وەك ئەرك ل سەر موسلمانان فەر دکەت:

١- تەرمێ وی بشۆن و بێنخوەش بکەن و کفن بکەن.

٢- نڤێژا مری ل سەر بکەن.

٣- ل دوو تەرمێ وی بچن و ڤەشێرن (بنئاخ بکەن) و دوعایان بۆ بکەن.

٤- پشکدارییێ د نەخوەشی و خەمێن خودانێن مریدا بکەن.

### بەلگە ل سەر خێرا وێ:

پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) دبێژت: **((من شهد الجنازة حتى يُصلى عليها فلهُ قيراط، ومن شهدها حتى تدفن فله قيراطان، قيل: ما القيراطان: قال مثل الجبلين العظيمين))**. ئانکو: کەسێ ل سەر تەرمێ موسلمانەکێ بەرهەڤ ببت، هەتا نڤێژ ژی ل سەر دئێتە کرن، قیراتەکا خێرێ دێ ب بەر کەڤت، و کەسێ ل سەر بەرهەڤ ببت، هەتا دئێتە ڤەشارتن و بنئاخکرن، دو قیراتێن خێرێ دێ ب بەر کەڤن. پسیار ژ پێغەمبەری هاتە کرن، کا دو قیرات چنە، ئینا گۆت: تەمەت دو چیایێن مەزنن.

### حوکمێ وێ:

نڤێژا مری (فرض كفاية)ە، ئانکو: هندەك پێ ڕابن و بکەن، ل سەر یێن نەکری ژی ڕادبت.

### چاوابییا کرنا وێ:

نڤێژەکا بێ داچەمیان و بێ سوجدەبرن و بێ ڕوونشتنە، و خواندن تێدا ژ بەرێ ئیمامیڤە بێ دەنگ دەرئێخستنە. ڕێ و ڕەسمێن نڤێژا مری ژی ب ڤی ئاوایینە:

١- تەرم دێ ئێتە بەرقیبلەکرن.

٢- نڤێژکەر بەرقیبلە و ل پشت ئیمامی ب ڕێز دێ ڕاوەستن، و باشترە ڕێزێن وان ژ سێیان کێمتر نەبن.

٣- ئیمام چار تەکبیران دێ دەت، ئانکو چارجا دێ بێژت (الله اكبر)، و د هەر تەکبیرەکێدا، دەستەدوعا دێ دەستێن خوە بلند کەت، و نڤێژکەر ژی دێ ل دووڤ تەکبیران دەن و ب ڤی ئاوایی:

أ- تەکبیرا ئێکێ: پشتی وێ، ئیمام و جەماعەت، سۆرەتا (فاتیحە)یێ، د دلێ خوەدا، ئانکو بێ دەنگ دەرئێخستن، دێ خوونن.

ب- تەكبیرا دویێ: پشتی وێ، ئیمام ب جەماعەتڤە، دێ سلاڤا ئیبراهیمی خوونن، کو ئەڤەیە:

**((اللهم صلِّ على محمدٍ وعلى آل محمد كما صليت على ابراهيم وعلى آل ابراهيم أنك حميد مجيد، اللهم بارك على محمد وعلى آل محمد كما باركت على ابراهيم وعلى آل ابراهيم انك حميد مجيد)).**

ج- تەكبیرا سێیێ: پشتی وێ، داخوازا دلۆڤانی و گونەهژێبرنێ بۆ مری دێ ئێتە خوازتن و باشترە ب ڤی ئاوایی بت: **((اللهم اغفر لحينا وميتنا، وشاهدنا وغائبنا، وصغيرنا وكبيرنا، وذكرنا وانثانا، اللهم من احييته منا فاحيه على الاسلام ومن توفيته منا فتوفه على الايمان، اللهم ان كان محسناً فزد في احسانه وان كان مسيئاً فتجاوز عنه... ياأرحم الراحمين))**. ئانكو: خودێوۆ، تو ل گونەهێن ساخ و مرییێن مە، حازر و نەحازرێ مە، بچووك و مەزنێ مە، ژ نێر و مێیان، ببۆری. خودێوۆ، هەچیێ ژ مە تە هێلا ساخ، ل سەر ئیسلامێ بهێلی، و هەچیێ تە مراند، تو ل سەر باوەرێ بمرینی، خودێوۆ، ئەگەر قەنج بت، تو قەنجتر لێ بكەی، و ئەگەر ژ خوە خراب بت، تو لێ ببۆری، هەی دلۆڤانێ ژ هەمی دلۆڤانانان، دلۆڤانتر.

ئەگەر مری زارۆك بت، دێ دوعایا هندێ ئێتە كرن، كو خێرا دەیبابان پێ بێتە زێدەكرن و خودێ مرییێ وان بدەتە د گەل مرۆڤێن باش و ژ وان بهەژمێرت.

د- تەكبیرا چارێ: پشتی وێ ئەڤ دوعایە دێ ئێتە خواندن: ((اللهم لاتحرمنا اجره ولاتفتنا بعده، واغفر لنا وله - ئانكو: خودێوۆ تو مە ژ خێرا وی بێ بار نەكی، و پشتی وی مە ب سەردا نەبەی، و ل گونەهێن مە و وی ببۆری)). پاشێ ئیمام نڤێژا مری ب سلاڤا ملێ ڕاستێ و یێ چەپێ ب دووماهی بینت و بێژت: **(السلام عليكم ورحمة الله)**، و دورستە سلاڤا ملێ ڕاستێ ب تنێ ژی بدەت.

## تشتێ نەدورست د دەمێ ڕاكرن و ڤەشارتنا تەرمێ مریدا:

١- دانانەخوە و خوەڤوتانە ب تەپ و كولمان.

٢- ڤێڕی و گرییا ب دەنگێ بلندە.

٣- پێگۆتنە ب مری و كار و كریار و باشییێن وی.

٤- تەرمێ مری ل مزگەفتێ، ل جهێ قیبلەیا نڤێژكەران بێتە دانان، بەری نڤێژ ل سەر بێتە كرن.

٥- دەمێ مری دبنە گۆڕستانێ، ژن ژی د گەل تەرمێ وی بچن.

## دان و ستاندن

**١- وی تشتی بێژە ئەوێ پێدڤی موسلمان د دەرهەقێ مریدا بکەن؟**

**٢- چەند تەکبیر د نڤێژا مریدا هەنە؟**

**٣- بەلگە چیە ل سەر خێرا نڤێژا مری؟**

**٤- ڤان ڤالاهییان ب پەیڤ و دەستەواژەیێن گونجایی داگرە:**

**نڤێژا مری (فرض ...........)ە، نڤێژەکا بێ ........... و بێ ........... و بێ ......... و خواندن تێدا ب دەنگێ ......... و باشترە هەژمارا ڕێزێن نڤێژکەران ژ ............. کێمتر نەبن.**

**٥- وێ دوعایا تە ژ بەر، ئەوا بۆ مری دئێتە خواندن بێژە.**

**٦- دوعایا پێدڤی بۆ مری بێتە خواندن، ئەگەر مری زاڕۆك بت، کیژکە؟**

**٧- هندەك ژ وان تشتێن نەدورست دیار بکە، ئەوێن د دەمێ ڕاکرن و ڤەشارتنا تەرمێ مریدا دئێنە کرن.**



## وانەیا بیست و شەشێ

# ڕەوشتێن بەهی و سەرخوەشییان

**سەرخوەشی:** ئەوە پشتی مرنا کەسەکێ، مرۆڤ ل بەر دلێ مالا مری بدەت و داخوازێ ژ خودانێن وی بکەت بێنا خوە ل سەر ڤێ نەخوەشییێ فرەھ بکەن و ب قەدەرا خوە ڕازی ببن.

**ئاخڤتنێن د سەرخوەشییاندا دئێنە گۆتن:**

سەرخوەشی ب هەر ئاخڤتنەکا دلخوەشکەر دئێتە جهئینان، نەخوەشی پێ ل سەر مالا مری و خودانێن وی سڤك ببت و خەمێن وان پێ ڤەڕەڤن، و داخوازا بێنفرەهکرنێ تێدا بت. ئێك ژ وان گۆتنێن پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) د سەرخوەشییاندا دگۆتە خودانێ مری، ئەڤەبوو: **((ان لله ما أخذ، وله ما اعطى، وكل شيء عنده بأجلٍ مُسمى، فلتصبر ولتحتسب). (بوخاری ڤەگێڕاییە)**. ئانکو: ئەوێ خودێ بری، هەر ئەوی داییە، و ئەوێ دایی ژی هەر یێ وییە، و هەر تشتەك ل دەڤ ب ڕۆژا خوە دچت، بێنا خوە فرەھ بکە، دا خودێ بۆ تە ب خێر بنڤیست.

و ژ گۆتنێن بەلاڤ ئەوێن د سەرخوەشییاندا دبێژنە خودانێ مری: **(خودێ خێرا تە مەزن بکەت، و دلێ تە خوەش بکەت و ل گونەهێن مرییێ تە ببۆرت و جهێ وی خوەش بکەت)**. ئەوێ سەرخوەشییا وی دئێتە کرن، د بەرسڤا سەرخوەشیکەریدا دبێژت: خودێ خێرا تە بنڤیست، و چو نەخوەشییان نیشا تە نەدەت.

**سەرخوەشی دورستە:**

سەرخوەشیکرن خێرە و دورستە، چ بۆ زەلامان بت، چ ژی بۆ ژن و زاڕۆکان. گەلەك فەرمۆدە ژ کیسێ پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) ل سەر خێرا سەرخوەشییێ، هاتینە ڤەگوهازتن، ژ وان: **((من عزى مصاباً فله مثل أجره - ئەوێ سەرخوەشییا خودان مرییەکێ بکەت، تەمەت خێرا خودانێ مری دێ گەهتێ)) (ئیبن ماجە و بەیهەقی داییە دیارکرن)**. ئەڤە هەمی ژ بەر وێ دلپێڤەیی و دلۆڤانی و هاریکارییا تێدا.

د ئیسلامێدا، دەمێ دورستێ بۆ سەرخوەشیکرنێ هاتییە ڤەبڕین و دەستنیشانکرن، پشتی ڤەشارتن و بنئاخکرنا مری، سێ ڕۆژن. و پشتی سێ ڕۆژان، تنێ بۆ وان کەسان دورستە، ئەوێن ژ دوور هاتین، یان ئەوێن نەحازر و ژێ بێئاگەھ.

## چێکرنا خوارنێ بۆ مالا مری:

یا باشتر و چێتر ئەوە، دەر و جیران و کەس و کار و نێزیکێن مالا مری خوارنێ بۆ وان بەرهەڤ بکەن، و نەهێلنە ب هیڤییا وانڤە، هەروەکی پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) فەرمان پێ دایی و گۆتی، دەمێ (جەعفەرێ کورێ ئەبیتالب) مری: ((**اصنعوا لآل جعفر طعاماً فقد أتاهم مايشغلهم – خوارنێ بۆ مالا جەعفەر چێکەن، ب نەخوەشییا خوەڤە مژوولن)) (ئەحمەد و ترمذي و حاكم ڤەگێڕاییە)**. باش نینە مالا مری و خودانێن وی، ب چێکرنا خوارنێڤە مژوول ببن، خوارنا وان و یا بەهیچنێن (بەهیدارێن) ژ دوور هاتین، دکەڤتە سەر دەر و جیران و کەس و کار و نێزیکێن مری.

## ڕێك و ڕەوشتێن نەدورست د شین و بەهییاندا:

١- ل بەر خوەکرنا جلکێن ڕەش و شین، و ب خوەڤەکرنا هەر نیشانەکا خەم پێ بێتە دیارکرن.

٢- نەتراشینا ڕهان وەك نیشان بۆ خەمخوارنێ، ژ بەرێ نێزیك و هەڤال و هۆگرێن مریڤە.

٣- مەزاختنا گەلەك پارە و مالی ژ ئێکا مەزناتی و خوەدەرئێخستنێڤە، ب ڕێکا بەرهەڤکرنا سفرەیێن زێدەمەزنێن خوارنێ، ژ بەرێ مالا مری یان کەس و کارێن ویڤە.

٤- نووکرنا خەم و شینا مری، ب ڕێکا دانا حەفتیك و چلرۆژك و سەرسالا مری.

٥- دیارکرن و درێژکرنا خەم و شینێ، پتر ژ سێ ڕۆژان.

## دان و ستاندن

١- ڕامانا سەرخوەشییێ چیە؟

٢- بەهی و سەرخوەشی چەند ڕۆژن؟

٣- کی دێ خوارنێ بۆ خودانێن مری چێکەت؟

٤- ئاخڤتنا بەلاڤا سەرخوەشی پێ دئێتە کرن، کیژکە؟

٥- بەلگە ل سەر خێرا سەرخوەشییێ چیە؟

٦- ڤان ڤالاهییان ب پەیڤ و دەستەواژەیێن گونجایی تەژی بکە:

سەرخوەشیکرن .................... چ بۆ زەلامان بت، چ ژی بۆ ....... و ........... باش نینە ........................ ب چێکرنا خوارنێڤە مژوول ببن.

٧ - هندەك ژ وان ڕێك و ڕەوشتێن نەدورست بێژە، ئەوێن د شین و بەهییاندا دئێنە کرن؟

## وانەیا بیست و حەفتێ

# ژ ڕەوشتێن فێرکرنێ

حەسەن و حوسەین (خودێ ژ وان ڕازی بت) - خۆرت بوون - پیرەمێرەك دیتن، دەستنڤێژ باش نەدگرت، بەرێ خوە دانە ئێكدو و ڤیان بێژنێ، چونكی پێدڤییە مرۆڤێ موسلمان دەمێ برایێ خوە یێ موسلمان ل سەر خەلەتییێ دبینت، دڤێت ڕێكا ڕاست و دورست نیشا بدەت و تشتێ نەزانت بۆ بێژت، نەمازە د وارێ دینیدا. لێ بەلێ ئەو بچووك بوون و ڕوویێ وان نەگرت ئێكسەر بێژنە پیرەمێری دەستنڤێژگرتنا تە خەلەتە، دزانین نە ژ ڕەوشتێ مرۆڤێ موسلمانە، ئێكسەر بێژتە یێ ژ خوە مەزنتر تو خەلەتی. ئینا هزرێن خوە د ڕێكەكێدا كرن، كو پێ دەستنڤێژا دورست نیشا پیرەمێری بدەن. حەسەن - برایێ مەزن بوو - خوە نێزیكی پیرەمێری كر و گۆتێ: مام، ئەز و برایێ خوە یێ بچووك ل سەر دەستنڤێژێ ب جرە چوویینە، ئەو دبێژتە من: دەستنڤێژا من ژ یا تە دورستترە، و ئەز دبێژمێ: نەخێر یا من دورسترە. مە دڤێت تو بكەڤییە ناڤبەرا مە و بەرێ خوە بدییێ، كا دەستنڤێژا كێ ژ مە ژ یا كێ دورسترە. حەسەن ڕابوو ل پێش چاڤێن پیرەمێری، دەستنڤێژا خوە گرت، پاشێ حوسەین ژی ڕابوو دەستنڤێژا خوە جوان گرت. پیرەمێر ب ڕێكا دەستنڤێژگرتنا وان ب سەر خەلەتییا خوە هلبوو و هەروەسا ب سەر سنج و ڕەوشتێ بلندێ هەردو نەڤییێن پێغەمبەری ژی (سلاڤ لێ بن) هلبوو، و زانی مەرەما وان ژ ڤێ هەمییێ ئەوبوو، خەلەتییا دەستنڤێژا وی نیشا بدەن بێ كو بێژنێ تو خەلەتی. كەیفا پیرەمێری گەلەك هات و داخوازا خێر و خوەشییێ بۆ وان ژی ژ خودێ كر.

**وانەیێن ژێ بێنە وەرگرتن:**

١. دڤێت ئەم بەرێ موسلمانان هەردەم بدەینە كارێ خێرێ و دینێ وان نیشا وان بدەین.

٢. پێدڤییە دەمێ بچووك سەرەدەرییێ د گەل یێ ژ خوە مەزنتر دكەت، ڕێزێ لێ بگرت.

٣. فەرە گوهدارییا ئاخفتنا بچووكی ژی بكەین و دڤێت ئەم پێ ژی بكەین، ئەگەر ژ مە دورستتر بت.

### دان و ستاندن

١- حەسەن و حوسەین كینە؟ كی ژ وان ژ كێ مەزنترە؟

٢- گرنگییا دەستنڤێژێ د نڤێژێدا، دیار بكە.

٣- دەستنڤێژا پیرەمێری چاوابوو؟

٤- ئەگەر تە ئێك دیت نڤێژا خوە دورست ناكەت، دێ چ كەی؟

## سەحابییێ ڤەدرگران جابانێ کورد

دەمێ مرۆڤ دیرۆکا ئیسلامێ ڤەدکۆلت، دگەهتە وێ باوەرێ کو هەمی مللەتێن موسلمان و هەر ئێکێ ب ڕەنگەکێ و چ کێم و چ زێدە، پشکداری د ئاڤاکرن و چێکرنا شارستانییا ئیسلامییا مەزندا کرینە، هەر ژ گزیرتەیا عەرەبی بگرە، هەتا دگەهییە سەرانسەری جیهانا ئیسلامییا بەرفرەه. هەڤبەندی و براتییا باوەرێ موسلمان ب ئاوایەکی وەسا پێکڤە گرێددان و بەرێ وان ددا ئاڤاکرن و خەباتێ کو مل ب مل دەست و لەپێن لێنان و ئاڤاکرنێ بن، و هەمی پەژان و سینۆر و ناڤبڕ د سنگێ واندا بێنە شکاندن. نە ڕەنگ نە زمان نە ئەرد ئاستەنگ نەبوون د ناڤبەرا وان و هەڤکاری و پێکڤەگرێدان و تەکووزیێدا. هەمی تێکدا ئێك لەش بوون، دەمێ ئەندامەکی وی لەشی ئێشگرتی دبوو، لەش پێکڤە ل سەر تاگرتی و دژخەو دبوو. هۆسا هەمی ناڤبڕ و ئاستەنگ د ناڤبەرا واندا ڕابوون، ئاڤاهییێ شارستانییا ئیسلامی ل سەر دەستێ وان سەرپێ و تەکووز بوو. ئەڤە سەلمانێ فارسی بوو، وێ هە بیلالێ حەبەشی بوو، ئەوێ دی سوهەیبێ ڕۆمی بوو، و یێ دی ژ مللەتەکی جودایێ دی بوو.. جابانێ کورد (خودێ ژێ ڕازی بت) ئێك ژ وان هەڤال و هۆگرێن سەرکێشێن کۆما هەڤال و هۆگرێن پێغەمبەری یێن ئێکێ بوو. گەلەك ژێدەر و سەرەکانییا تل بۆ هندێ درێژکرییە کو وی ژی سەردەمەکێ هەڤالینییا پێغەمبەری کرییە، نەمازە پشتی مشەختبوونا وی و ل باژێرێ مەدینەیا پیرۆز، و ژ وان ژێدەران: (تفسير روح المعاني) یا زانایێ ب ناڤ و دەنگ ئالووسی، و کتێبا (أسد الغابة) یا (ابن الاثير)، و کتێبا (الاصابة في تمييز الصحابة) یا (ابن حجر العسقلاني) و هندەك ژێدەرێن دی. هەبوونا سەحابییەکی کورد ب ناڤێ (جابانێ کورد)، د ناڤ سەحابییێن پێغەمبەریدا، بەلگەیەکا ب هێزە، ل سەر هەبوونا هندەك جوونە هەڤبەندییان د ناڤبەرا مللەتێ کورد و مللەتێ عەرەبدا بەری ئیسلامێ ب دەمەکی نێزیك، ڤێجا ئەو هەڤبەندییە چ بازرگانی بن چ ژی یێن جیرانییێ بن. وە دیارە، هەڤناسینا ڤان هەردو مللەتان، هەتا سەردەمێ بەلاڤبوونا بانگ و گازییا ئیسلامی ژی، د ئاخ و کاخا گزیرتەیا عەرەبیدا بەردەوامی کێشاییە.

گەرما هەڤالینییا (جابانێ کورد) بۆ پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) ل مەدینەیێ بوو، بەلگە ل سەر وێ چەندێ، ئەو فەرمۆدەنە ئەوێن وی ڤەگوهازتین، کو دوباری ب فەرمان و کاروبارێن جڤاکیڤە گرێدایی بوون، وەکی ژنئینانێ و وان. هندی سەردەمێ مەکی بوو، بانگ و گازی دوباری ل سەر بیر و باوەران بوو. لێ بەلێ سەردەمێ مەدەنی، دوباری ل دۆر پێکئینانا حوکمەتا ئیسلامی بوو، و هۆسا کاودان، بۆ ئاڤاکرنا شارستانییا ئیسلامی، بەرخوەش بوون. سەردەمێ ژێگۆتی، دەلیڤەیەکا گونجایی و بەرخوەش بوو، بۆ

بنەجهکرن و ماککرن و کوورکرنا باوەرێ، کو خوە فەرمان و سەرەدەری و بازاڕان ژی بگرت. ڤی سەحابییێ کوردێ ئاخفتن ل سەر، کوڕەك ژی هەبوو، ناڤێ وی (مەیموونێ کورد) بوو، پشتی سەردەمێ پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن)، سەردەمەکی خوەش د گەل تابعییان ژی دەربازکر. پشتی ڤێ کێل و بێژنگکرنێ، دەستڕاستییێن مێژوویی مە دگەهیننە ڤان ئەنجامان:

١- (جابان) کوردە، و گەلەك سەرەکانی ڤێ چەندێ پشتڕاست دکەن، نەمازە ئەوێن ل دۆر کوردینییا کوڕێ وی مەیموون دئاخڤن.

٢- (جابان) زمانێ عەرەبی باش دزانی، و ئەڤە بەلگەیەکا ڕۆنە ل سەر هندێ کو دەمەکی درێژ ل حیجازێ بۆراندییە.

٣- (جابان) ژ سەحابییانە، وی پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دیتییە، و فەرمۆدە ژێ بهیستینە و ژێ ڤەگوهازتینە ژی. دیارە گەلەك مرۆڤەکی تەقواداربوو، لەو خوە ژ هندێ دوور ئێخستییە کو گەلەك فەرمۆدەیان ژ پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) ڤەگوهێزت، دا نەکەڤتە خەلەتییێ.

٤- نە جارەکێ ب تنێ (جابان) تشت ژ پێغەمبەری بهیستییە، بەلکو گەلەك جاران، و دیتنا وی بۆ پێغەمبەری، نە هەما دیتنەکا سەرپێ بوو.

٥- دووماهییا چەرخێ نەفامییێ و سەرێ پەیدابوونا ئیسلامێ، عەرەبان کورد وەك مللەت دنیاسین، و دزانین کورد مللەتەکی خوەسەرن و ناڤێ تایبەتێ خوە هەیە، و ئەو و فارس و ترك ژێك جودا دکرن، گەلەك سەحابی ب ناڤێ مللەتێ خوە دهاتنە نیاسین، وەك نموونە: جابانێ کورد، سەلمانێ فارسی و سوهەیبێ ڕۆمی.

٦- بێ گۆمان، تایبەتمەندی و کەلەپۆر و سنج و ڕەوشتێن ڕەسەنێن مللەتان، د شارستانییا ئیسلامیدا پارستینە، بەلکو وەرارا وان پتر و خورتترە، چ یێن عەرەبان بن، چ ژی یێن تورك و فارس و کوردان بن، ئەڤە هەمی ژ بەرێ و پاشییێدا، ستوون و ئاڤاکەرێن وێ شارستانییێنە.

٧- ئیسلام دینێ براتییێیە بۆ کوڕێن هەمی مللەتێن ژێك جودایێن موسلمان، هەروەسا دینێ تەکووزکارییا شارستانییە، بۆ هەمی ڕەنگ و جوونێن مرۆڤان، ل دووڤ گۆتنا خودایێ مەزن د قورئانا پیرۆزدا: ((يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ)) سۆرەتا (الحجرات ئایەتا ١٣).

## ڕاهێنان

### (١)

بەرسڤا ڕاست ئەوا د ناڤبەرا دو کڤاناندا بۆ ئەڤێن خوارێ هلبژێرە:

١- جابانێ کورد ژ (تابعینان، سەحابییان، هەڤچەرخان) بوو.

٢- جابانێ کورد ل حیجازێ ژیا بۆ (دەمەکی کورت، دەمەکی درێژ، دەمێ سالەکێ).

٣- جابان گەلەك (تەقوادار، چاڤتەنگ، ترسۆکە) بوو.

٤- ملەتێن ئیسلامی هەمییان پشکداری د (شەڕان، ئاڤاکرنا شارستانییا ئیسلامی)دا کر.

٥- ئیسلام دینێ براتییێ بوو د ناڤبەرا (کوڕێن ملەتێن ژێك جودا، عەرەبان ، هەڤپشکچێکەران)دا.

## ڕاهێنان

### (٢)

١- بۆچ جابان خوە دوور دئێخست ژ ڤەگوهازتنا گەلەك فەرمۆدەیان؟

٢- ئەرێ عەرەبان کورد ژ نێزیك دناسین یان نە؟

٣- هەڤبەندییا بنیاتی د ناڤبەرا ملەتێن موسلماناندا چیە؟

٤- جابان کوڕەك هەبوو، ناڤێ وی و نازناڤێ وی چ بوو؟

٥- ناڤێ سێ سەحابییێن نەعەرەب بێژە.

## وانەیا بیست و نەهێ

# ژ ڤلیبیێن دادوەرییا قازی شورەیحێ تابعی

ئێك ژ تابعییێن مەزن بوو، و ئێك ژ وان كەسان بوو ئەوێن ژ ڕێڤە و هێژ زوو سەرێ گوهدارییێ بۆ بانگێ ڕاستییێ چەماندی و ب هەمی گیانێ خوەڤە پێگیری پێ كری. ستێرا وی د وارێ دۆستپەروەرییێدا ب ئاوایەكی وەسا د ناڤ موسلماناندا گەش بوو، و پێك و پەییسك و ناڤ و دەنگێ وی د ناڤ مرۆڤێن زانا و خودانباوەراندا هند بلندبوو، گەهشتە وێ ڕادەیێ، خەلیفەیێ دویێ (عومەرێ كوڕێ خەتتاب) ژ بەر دادپەروەرییا وی، قازییاتییا باژێرێ كۆفە سپارتێ. گۆتن و كریار و سەرهاتی و بڕیارێن دادپەروەرییا ڤی تابعییێ قەدرگرانێ بەركەڤتی، گەلەك مشەنە د ناڤ بەرپەڕێن كتێبێن دیرۆكییێن وی دەمیدا، ئێك ژ وان ئەڤەیە:

دبێژن كوڕێ وی ڕۆژەكێ گۆتێ:

باب، دۆز و نەلێكییەك د ناڤبەرا من و هندەكاندا هەیە، بڕێنێ ئەگەر ئەزی هەق بم، دا داخوازا هەقێ خوە ژ وان بكەم و وان بكێشمە دادگەهێ، ئەگەر ژ خوە ئەو هەق بن، دا بچم پێكهاتنێ د گەل وان بكەم و بێ دادگەه وان قایل بكەم. پشتی ئەڤ ئاخڤتنە كری، چیرۆكا خوە و وان بۆ بابێ خوە شورەیح گۆت. شورەیح گۆتە كوڕێ خوە: هەڕە داخوازا خوە ل سەر وان ب ڕێڤە ببە و وان بكێشە دادگەهێ. كوڕێ وی ب پشتگەرمی چوو دەڤ نەیارێن خوە و داخواز ژ وان كر كو ئارێشەیا خوە ل دادگەهێ، بەرانبەری قازی (كو بابێ وییە) ب دووماهی بینن. دەمێ هەردو ئالی، بەرانبەری قازی ڕاوەستایین، و دۆز و ئارێشە كەڤتییە د تەرازوویا دادگەهێدا، هەقی ل سەر دەستێ قازی شورەیح بۆ نەیارێن كوڕێ وی كەڤت، و وان د دادگەهێدا سەركەڤتن ب دەست خوەڤە ئینا. دەمێ شورەیح و كوڕێ خوە ڕێكا مال گرتین، ب ڕێڤە كوڕێ وی گۆتێ: باب ئەز پشتگەرمێ تە بووم و تە ئەز شەرمزاركرم، باوەركە من بەری دادگەهێ، پسیارا خوە ب تە نەكربا، من گازندە ژ تە نەدكر. ئینا بابێ وی لێ ڤەگێڕا و گۆتێ: كوڕێ من، ژ خودێ باوەر بكە، ڤیانا تە ژ یا هەر تشتەكی ل سەر ڕوویێ ڤی ئەردی پترە د دلێ مندا، لێ پشتڕاست بە، خودێ ل دەڤ من ژ تە خوەشڤیترە. ئەز ترسیام بێژمە تە ئەو ژ تە هەقترن، چونكی دا ڕابی ڕێكا پێكهاتنێ گری و وان ب هندێ ڕازی كەی و هندەك هەقێ وان ب هندێ دا بەرزە بت. ئەها من ژ بەر هندێ گۆتە تە، هەڕە داخوازا هەقێ خوە ژ وان بكە و وان بكێشە دادگەهێ.

## دان و ستاندن

١- سالۆخەتێن کەساتییا قازی شورەیحێ تابعی چنە؟

٢- بۆچ عومەرێ کوڕێ خەتتاب (خودێ ژێ ڕازی ببت) کرە قازی ل باژێرێ کۆفە؟

٣- کوڕی چ گۆتە بابێ خوە شورەیح؟ و بابێ وی چاوا لێ ڤەگێڕا؟

کوڕی گۆت ..................

بابێ وی گۆتێ ...............

٤- کوڕی چ گۆتە بابێ خوە، پشتی هەڤی بۆ نەیارێن وی ئێخستی، و بابێ چاوا بەرسڤا کوڕێ خوە دا؟

کوڕی گۆت .................

بابێ وی گۆتێ ..................

٥-چ چام ژ ڤێ چیرۆکێ دئێتە وەرگرتن؟

# ژ بانهلدێرێن موسلمانێن کورد سەعیدێ نوورسی



## بوونا وی:

نـاڤێ وی سـەعید کـوڕێ مـیرزا کـورێ عـەلی کـوڕێ خـدر کـوڕێ مـیرزا خالیـدە، ل سـالا (١٨٧٣ز) ل گونـدێ (نوورس)ێ، ئەوێ سەر ب ویلایەتا (بتلیس)ێڤە، کو دکەڤتە ڕۆژهلاتی ئەنەدۆلێ، و ژ بنەمالەکا کورد، ب سەر دنیایێ کەڤت. زانینێن خوە یێن ئیسلامی و زانستێن نـوو، ل سـەر دەسـتێ زانـایێن بـاژێرێن وەلاتـێ تورکی یێن وی وەختی وەرگرتن.

## پێك و پەیسکا وی یا زانستی:

(نوورسـی) خـودانێ هزرەکـا تیـژ و دژوار و بیردانکـەکا ب هێـز و هشـمەندییەکا تـەکووز بـوو. ژ بـەر زێـدەزانینا وی، د وارێ هـەمی زانینـێن ئیسـلامی و نەئیسـلامیدا، د دەمـەکی نـە گەلـەك درێـژدا بـوو زانایەکی بێ هەڤرك و مەزن، ناڤ و دەنگێ وی ل هەمی وەلاتێ تورکی و جیهانـا ئیسلامی گـەڕیا و بـەلاڤ بوو. (نوورسی) ژ بلی زمـانێ خـوە یـێ کـوردی، شـارەزایی د زمـانێ عـەرەبی و تورکیـدا ژی هـەبوو. ژ بـۆ بەلاڤکرنا بانگ و گازی و پەیاما ئیسلامی یا سنگفرەه، گەلـەك بـاژێر تێکڤـەدان و قەسـتا گەلـەك جه و واران کر، و شیا گەلەك فێرخواز و زانایان ل خوە کۆم بکەت، کو زانـینێ ژێ وەرگـرن و ل سـەر شۆپا وی پێگاڤان خورت باڤێژن و ڕێکا وی بگرن. نوورسی گەلەك کتێب و نـامە هەنـە کـو گەلـەك وارێـن زانستان

ڤەدگرن، و ژ گرنگترین و ناڤدارترین کتێب و نڤیسارێن وی (نامەیێن ڕۆناهییێنە، کو ب عەرەبی دبێژنێ (رسائل النور).

## کەساتییا وی:

(نوورسی) مێرەکی مێرین و مێرخاس بوو، پشکداری د گەلەك بزاڤ و تەڤگەرێن ئازادیخواز و بەرخوەداناندا کر، و شیا ب ڕێکا گۆتن و کریار و نڤیسینێن خوە بەرگری و بەرەڤانییێ ژ بیر و باوەر و بنەمایێن دینێ ئیسلامێ یێ پاك و پاقژ و مافێن مرۆڤی بکەت، و بەردەوام داخوازا چاکسازییێن جڤاکی و سیاسی دکر، و ژ بەر هندێ، هەڤتووشی پیسترین و نەخوەشترین ستەمکارییێ بوو، گەلەك سالان و پڕ جاران ژ بەرێ ڕژێما دکتاتۆرا سەردەمێ خوەڤە، کەڤتە زیندانێ، و هاتە دوورئێخستن و سەرگومکرن بۆ جهێن دوور و دەراز و ڤەدەر. (نوورسی) گەلەك هەلوێستێن دیرۆکییێن بێ وێنە د گەل سەردارێن وێ ڕژێمێ و غەیری وێ هەنە، کو ڕاستگۆیی و خوەڕاگری و گۆتنا هەقییێ ددەنە خویاکرن. گەف و بەرگەڕیانێن ب هەمی ڕێکان، ژ بەرێ وان سەردارانڤە هاتینە کرن، نەشیان وی ڕاوەستینن و دەستگرێدایی بکەن، یان دەڤێ وی بدەنە ئێك و بەرێ وی ژ وان هەلوێستێن خوەجە و نەلڤ وەرگێڕت. پشکداری د شەڕێ جیهانی یێ ئێکێدا کربوو، و هاتبوو ئێخسیرکرن، و ژ ئێخسیریێ ڕەڤیبوو، و ل دەستپێکا سەدسالا بیستێ کار بۆ دامەزراندنا زانینگەهەکا ئیسلامی یا وەکی زانینگەها ئەزهرێ کر، بەلێ ژ بەر دەستپێکرنا شەڕی ئەو کار ب جه نەهات، و وی خەم ژ بلندکرنا ئاستێ زانستی و ڕەوشەنبیری یێ گەلێ کوردستانێ دخوار، و د ڤێ ڕێکێدا وی ڕێبازا خوە د ژیانێ دا گوهاڕت و خوە ژ ژیانا سیاسی دوورکر و دەست ب نڤیسینا وان نامەیان کر یێن کو بـ (رسائل النور) هاتینە ناسین کو ژ قورئانێ دوەرگرتی بوون، و ب هزاران شاگرد ل سەر دەستێ وی ڕابووینە، و وان کۆمەلەکا بانگخوازییا نە سیاسی ب ناڤێ (کۆمەلا نوور) ئاڤاکر، و کتێبێن وی بۆ گەلەك زمانان هاتنە وەرگێڕان ژ وان زمانێ کوردی.

(٢٧) سال ژ ژیانا خۆ د گرتیخانە و دوورخستنێدا بۆراندینە و ل سالا ١٩٦٠ چوو بەر دلۆڤانییا خودێ پشتی ب هزاران بەرپەڕ و ب سەدان هزار شاگرد ل پاش خۆ هێلاین.

## دان و ستاندن

١- نوورسی ل کیرێ ب سەر دنیایێ کەڤتییە؟ و کەنگێ؟

٢- نوورسی ل کیرێ خواندییە؟

٣- گرنگترین سالۆخەتێن کەسینییا نوورسی بێژە.

٤- ئەگەرێ ناڤدێرییا نوورسی یا جیهانی چیە؟

٥- نوورسی مێرەکی مێرین و مێرخاس بوو. بەرسڤا خوە ب هەلوێستەکی وی پشتگەرم بکە.

٦- ئەگەرێ ل پشت گەلەك زیندانیکرن و سەرگومکرنا وی چ بوو؟



# ناڤەڕۆك